# گەشتێکی عیرفانی بەرەو مەدینەی مونەوەرە




ئەبولحەسەنی ئەندویی

ئامادەکردن و وەرگێڕانی:
زانا ناجی غوڵامی

# گەشتێکی عیرفانی بەرەو مەدینەی مونەوەرە

ئەبولحەسەن ئەننەدویی

ئامادەکردن و وەرگێڕانی: زانا ناجی غوڵامی

## ناسنامەی پەرتووک


- ناوی پەرتووک: گەشتێکی عیرفانی بەرەو مەدینەی مونەوەرە
- نووسەر: ئەبولحەسەن ئەننەدویی
- بابەت: وێژە
- ئامادەکردن و وەرگێڕان: زانا ناجی غوڵامی
- پێداچوونەوەی: هیوا مەحمود، خەڵات موحسین
- هەڵەچنی: زانا ناجی غوڵامی
- روونمای بەرگ: هیوا تاوگۆزیی
- روونمای ناوەوە: م. ئاراس حەمە ئەمین
- نۆرەی چاپ: یەکەم
- چاپخانەی: هێڤی
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- تیراژ: ٥٠٠

## پێشکەشە

❖ بە (( مامۆستا مەلا ئەحمەدی سیروان)) ناسراو بە مەلا ئەحمەدی دوجەیلە، ئەو پیاوەی؛ عیرفانییانەو بەو پەڕی خۆشەویستیی و عیشقەوە ماوەی پتر لە (( چل و نۆ)) ساڵی رەبەقە بێووچان خزمەتی ئەم ئیسلامە دەکات.

❖ بە تەفسیرەکەی ((مامۆستا مەلا سەعیدی زمانکۆیی))

((غوڵامی ))

# پێشەکی وەرگێڕ

مەحوی دەفەرموێ:

**لە ڕۆژێ هەڵدرا ئەم کۆنە خەیمەی تان و پۆشینە**

**لە سایەیدا شەرابی بەزمی عوشرەت گریە جۆشینە**[1]

---

[1]– واتە: لەو ڕۆژەوە ئەم دەوارە کۆن‌و تان‌و پۆشینەی ئاسمان هەڵدراوە، جگە لە گریەو ئازار، ئیدی هیچ خۆشی‌و ڕابواردنێکی تێدا نەبووە.

**تێبینی:** زۆرینەی ئەو شەرحانەی کە بۆ هەریەکە لە هۆنراوەکانی ((مەحوی‌و نالی)) کراوە، لەهەردوو دیوانی ئەو دوو زاتە وەرگیراوە؛ کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و مامۆستا فاتیحی " گیان شاد"و مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریمەوە لێیان کۆڵیوەتەوەو شەرحیان پێداوە، بۆیە ئەم تێبینییەمان خستە بەر دیدی ئێوەی هێژا؛ لەبەر ئەوەی لە هۆنراوەکانی دیکەدا دووبارەی ناکەینەوە. هەرچی دەربارەی شەرحی هۆنراوەکانی ((بێخود))ی سالیکیشەوەیە، ئەوا کۆی هۆنراوەکانی کە پێم وابێ لە شوێنێکی ئەم پەرتووکەدا ئاماژەم بە سەرچاوەکەی داوە، لە "

دەبینی جێیەك ئەمڕۆ بەزمی عەیش‌و بادە نۆشینە

سبەینێ زوو، زەمانە وەزعی گۆڕیوە، لە نۆ، شینە[2]

لەکێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت ؟

عەزاپۆشی چییەو کێیە، جلی پیرۆزە بۆ شینە ![3]

وتم: بۆ ڕووت‌و ڕوتن ئەو کەسانەی عاشقی ڕووتن ؟

وتی: شان‌و شکۆهی زیندە دڵ، هەر ژەندە پۆشینە[4]

---

دیوانی بێخود" کە مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم شەرحی کردووە، وەرگیراوە. *غوڵامی*

[2]- واتە: هەر شوێنێکت بەرچاو کەوت کە ئەمڕۆ جێگای بەزم‌و ڕابواردن‌و خۆشی بێ، پێی هەڵنەخەڵەتێی‌و وابزانی بەردەوام هەر وادەبێ، چونکە هەر ئەوەندەت زانی سبەینێ زەمانە تێکیداوەو سەرلەنوێ دەیکاتەوە بە شوێنی شین‌و شەپۆڕ.

[3]- مەحوی گەورە دەیەوێ بڵێ: دیاردەی خەم‌و خەفەت‌و مەینەت لەم جیهانەدا، وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە ئادەمیزادەوە، بەڵکو تەنانەت بێگیانەکانیشی گرتۆتەوە. ئەوەتا یاقووت کەبەردێکی سوورە، سوورییەکەی خوێنی خەم‌و خەفەتی ناو دڵیەتی‌و پیرۆزەش کەبەردێکی تری گران بەهایەو شینە، شینییەکەی جلی تازییبارییە لەبەری کردووە... هەرچەندە ڕازو نهێنی ئەم تازییەبارییەی یاقووت‌و پیرۆزە بۆ ((مەحوی)) دەرنەکەوتووەو نازانێ کە هی چییەو لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە.

کوڕی بێ، تا سەر ئەم دایەی زەمانە مەمکی کەس نادا

کە سەعبە شیری شەفقەت ((مەحویا)) لەم شێرە دۆشینە[٥]

لەمێژە لێرە نییەو دەنگو سەدای هەر نوێیەو بەردەوام بەبێ تەقولباب خۆی بەناو ژوور بە ژووری دڵو ویژدانماندا ئەکاتﷺ. ئەو بە خۆیو قافڵەیەك خۆشەویستییەوە هەمیشە میوانی مرۆڤەﷺ. ئەو بە خۆییو زەمیلەیەك نەورەسەوە، قاچ لە ئاسمانی باوەڕمان گیر دەکات. بەوەدا دەیناسمەوە جانتایەکە بۆ هەموو سەفەرێكو سەفەرێکە بۆ گەشتی دنیاکان. چیت پێبڵێم ئەی دۆستی منﷺ ؟ جێگەی نوستنەکەت کە خودا لەپەڕاوەکەیدا تۆماری کردووە، دڵی هەژارانەو پێخەفی ژیانی ماڵ بە ماڵی ئەم دنیایەیە. ئەمێستاش دەیبینم، بەڵێ ئەوە ئەوە کە؛ بە ئەوینە تەڕییەکەیەوەو، بەسۆزی پڕ تاسەیەوەو، بەهەمان ئەو وەجدەی جارانییەوە، دەستە گوڵی ئاشتی بەسەر تێکرای

---

[٤]- پووت: پوچەڵ. زیندە دڵ: ئەوەی دڵی زیندوو بێ. ژەندە: کۆنو ڕزیو. مەبەستی ئەوەیە عاشق لەپێناوی خۆشییەکەیدا دەست لەهەرچی خێرو خۆشی دنیا هەیە هەڵدەگرێ.

[٥]- سەعب: صعب.

واتە: تەنانەت دایکی زەمانەش تا سەر شیر بەکوڕی خۆیشی نادات، چونکە زەمانە شێرێکی دوڕندەیەو شیردانیش نیشانەی بەزەییو دڵ نەرمییەو، ڕەحمەتە شیری بەزەیی هاتنەوە لە مەمکی دوڕندەوە دادۆشرێ.

شەرەنگێزانی جیهاندا دەبەخشێتەوەو، دەستی میهر بەسەر سەری بێنەوایان‌و لانەوازان‌و دڵپەستیواندا دەهێنی‌و، ئاوی سازگاری سەرچەشمەی چەشنی دیدەی قرژاڵ کە خۆری زیوینی بەرەبەیان داباریبێتە سەری، بەقورگی ووشکی کرێکارانی دڵماندو و دەست‌وپێ قڵیشاوی دنیا دەکات‌و، پێیان دەڵێت:" ئیدی ساتێك لەدەستی چەرخی چنگ بەخوێنی کەونەوە ئۆقرە بگرن‌و تاوێك بحەوێنەوە".

**((رێبوارێکی ماندو وای ووت))**

ئەو دەمەی بیر لە گوفتاری تۆ دەکەمەوە و لەخۆم رادەمێنم، ئەوا گشت خۆشییەکانی دونیام لەبەرچاو دەکەوێت. من شەپۆلێکم لە سۆز، لە ئەوین، لە بڵێسەی عیشقی دین. ((**بولبولێکی تۆشەبار، ئەمەی ژنەوت))**

دەووترێت: مرۆڤ دووساڵی رەبەقی پێویستە بۆ ئەوەی قسە فێربێت؛ بەڵام پەنجا ساڵی دەوێت تاوەك فێری بێدەنگی ببێت[٦]. ئەی سەروەرم ﷺ بڕوا بکە دوورو نزیك ئەم گوتەیە من ناگرێتەوە، چونکە نەدەتوانم لەئاستدا قسەبکەم‌و نە بێدەنگیش بم! من ئەو ساتەی شاکارەکەی ((مەحوی)) گەورە کەلە [سەدو بیست‌و چوار] بەیت پێکهاتبوو، دەخوێندەوەو بەدێری (**وصلی الله علی ئەو بەحری نووری عیلم‌و عیرفانە**))ش، دەست پێدەکات، بەهیچ شێوەیەك وەك هاوڕێیانی دیکەم، سەراسیمەی نەکردم یان جوانتر بڵێم تووشیاری شۆکی نەکردم،

---

[٦]- گەورە رۆماننووس: ئەرستن هەمنگوای.

چونکە ئەو زاتە زانیویەتی لەتەك كێدا دەكەوێتە گفتوگۆ، دەزانیٚ لە گەڵ چ زاتێکدا قسە دەکات، ئازیزی دڵم ﷺ باوەڕبکە، لەنێوان متبوونی بێدەنگی و بڵێسەی سۆزمدا.. بەردەوام لە چاوەنواڕیتا ئارەزوومەندییم لێدەچۆڕیٚ، هیوام بەبەردا دێتەوە، پڕ بەدڵ تامەزرۆ بووم، گەر بۆ جارێکیش بایە نووری جەماڵی جەنابتم بدیبایە، بەڵام ئەوە هەر نابیٚو بگرە مەحاڵیشە؛ بەڵکو دەتوانم بڵێم کە ئەو قسەیەی دەوترێت:" مەحاڵ مەحاڵە" ئەم هاوکێشەیەی من لەتەك جەنابتدا ﷺ نایگرێتەوە. ئەریٚ براله؛ چلۆن ڕووت یەت بەم کۆڵە گوناهەوە، بەم سۆزە لاوازەوە، بەم نەستە بیٚ هەستەوە، بەم فامە کاڵفامییەوە، بەم شەوکەتە بیٚ هیممەتەوە، بەم کۆڕانی جودا جودایەوە، بەم ئادابە بێئەدەبەوە.. بێیتە حوزورو وەها قسەیەك ببێژی، ئەدی پیاوی حسابی نابیٚ لە عاست زاتێکی وەهادا ﷺ قسەت ببێژیو ئینجا بیوێژیت، تا دووچاری بێئەدبی لە حوزووری ئەو سەییدەی مەخلوقاتەدا نەبیتەوە، ئەریٚ نەتژنەوتووە کە ((بێخوود))ی گەورە فەرموویەتی:

زاتێکی وەهای گرتووە ڕۆحم بەفیدای ئەوﷺ

شاهان شەو ڕۆژ دێنە قەدەم بۆسی گەدای ئەوﷺ

((بێخود)) مەبە ئیتر بە ئومێدو بە تەمای ئەوﷺ

نایەتەوە لات، گەر سەری داناوە، دڵـی من

ئەمێستاش لەدووری تۆدا باڵندەکانی سۆزو شەوقو هەستم،

کۆدەکەمەوەو پۆل پۆل دەیانگرێنم، تەنانەت ئەوشەوانەم لەیاد ناچێ، که بەدیار لوشکه لوشکی گریانی هەستمەوەو، شەتاوی تەڕی لەسۆزی دڵمەوەو، لەعیشقی پڕ تاسەی ڕۆحمەوە، پەروانەکانیش دەستیان دەکرد بەگریان. گشت چراکان بەدیار گریانی دوورو درێژی دڵمەوە پرتە پرتیان تێکەوت‌و دەکوژانەوە، ئیدی من لەتەك ئەوینی تۆدا ئەو شەوە تاریکەی دڵم‌و، ئەو بیابانە کاکی بەکاکییەی ڕۆحم‌و، ئەو جەنگەڵستانە تەڕییەی خەم‌و، تاسەو، هەنیسك‌و، پڵمەو، هەسکەهەسکم لەگەڵ فەجری کازیبدا دەکردەوەو، پاتەو پات‌و بێمەراییش بە دەستنوێژی نوێژی خەوتنانەوەو، بەدیار هەنسیکی گریانی دووری تۆوەو ڕۆحی سادیقانەی جەنابتەوە ﷺ، چاوەنواڕی فەجری سادیق‌و کازیوەی بەرەبەیانم دەکرد، ئیدی لەپاش بەرەبەیانەوەو لەتەك جریوەی پاسارییەکانداو تنۆك تنۆکی ئاورنگی سەر گەڵاکانداو لەگەڵ ڕەحیق‌و گوڵاویی سەر گوڵەکانداو هەڵهاتنی خۆری زیوینی بەرەبەیاندا؛ بەچاوی خۆم دەمبینی چلۆن ئەو هەموو بوونەوەرە شایەتی بە شانی پیرۆزی تۆدا دەهێنن‌و ﷺ، چۆنیش گشت جریوەی بولبولەکان باس‌و خواسی تۆ دەبێتە خوانی بەیانییان، کۆترەکانیش هەنگوینی یادی تۆ دەبێتە ژەنینی دەنگی زوڵاڵی سەر لقی دارەکانییان.

بەڵێ؛ ئەوان وەهان، خۆ چەشنی ئێمە لەهەمبەرت بێوەفا نین، داك‌و بابم قوربانت بێ ﷺ، گفت‌وگۆی عیرفانی ئەوان لەتەك جەماڵی تۆدا پڕیەتی لە ئەوین، لە تاسە، لە ژین. ئێمەیەك کە کۆی ژیانمان بە

فەتارتا برد، خۆمان نەمانویست تۆ رێنوێنیکارمان بیت، ئێمە مەسارێکی دێکەمان گرتە بەر، جودا لەو بژاردەیەی تۆ، ئێمە ڕازی بووین بەوەی کە خۆمان بدەینە دەست نەفسمان‌و ئەو سەرکردەی هەمیشەیی ئارەزووەکانمان بێت، وتمان ئەی نەفس دەترسین گەر تۆ بڕۆیت بشکێ سوپامان. بەڵێ ئێمە هەر گوێڕایەڵ‌و گوێقوڵاخی ئەو بووین؛ بۆیە ڕۆژمان گەی بەم ڕۆژە، کەچەشنی ئاردی بن دڕکمان لێهاتووەو پساو و مات‌و مەلول ماوین، بەڵام دوابەدوای تێکڕای ئەم گفت‌وگۆیەی دەروونم دووبارە دەکەوتمە قسەو پێم دەووت:" **هەی دەروونی بێئاگا، چاك بزانە، ئەو دەمەی لەو پەڕی بێ هومێدی دایت، خوداوەند بەویستی خۆی دەرگایەکت بەڕوودا دەکاتەوە کەبە هیچ کلیلێك نەکرابێتەوە**".

ئیدی وورده وورده دەرگای دڵم بەڕوویی تۆدا دەکرایەوەو هەردەم ئەو قسەیەی ((**نورسی**)) گەورەم دەهاتە بەرگوێ کە فەرمووبووی:" **ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەشەریعەتێکی پاك‌و، ئایینێکی سروشتیی‌و، بەندایەتییەکی خاوێن‌و، نزاو لاڵانەوەیەکی بەکوڵ‌و، بانگەوازێکی گشتیی‌و، باوەڕێکی دامەزراوەوە ڕەوانە کراوە، کە هیچ شتێك نییە هاوچەشنی ئەوانە بێت کە ئەم هێناونی‌و، هەرگیز لەوانە باشتر نەبوەو نابێت**". ئەی ئەوکەسەی کە خودا کردویتی بەگەورەی ئەفرێندراوان ﷺ، بڕوا بکە لەوەتەی دەستم کردوە بە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکەی جەنابی "**ئەننەدویی**" لەم پێشەکییە ترساووم، ترساووم لەوەی قسەیەك نەکەم‌و ببێتە هۆی دڵگرانی تۆ، بەڵام ئەو دەمەی دەستم

بە پەسنی عیشقی تۆ کرد پێنووسەکەم لە یەکەمین پیتیدا شکا، دواتر بۆم دەرکەووت کە ئەوە منم هەمیشە لاسارانە، لارو وێرانە، خوارو خێچانە، هەڵدەتوتێمو هەڵدەتروشکێمو دەمەوێت وێچکەیەک[٧] لەژیانی تۆ بنووسمو پێنووسکەم ڕێگەم پێنادات‌و دەڵێت: ووریابە ئەم مەقامە مەقامی ڕێزو حورمەتە، ئاگاداربە تۆ ئەو کەسە نیت بتوانیت وەها کارێك ئەنجامبدەیت، قوربان باوەڕ بکە ئەوەشی کردوومە زۆر لەخۆکردن بووەو هیچی تر، وەرنا دەبێ ئەمن چی بم تا پەسنی تۆ بکەم لەکاتێکدا پەروەردەگاری عالەم خۆی لەوەسفدا فەرموویەتی ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلَى خلقٍ عظيم﴾، عائیشە خاتوونی حەرەمیشت فەرموویەتی: (( كان خلقه القرآن)). نووسەری ئەم کتێبە زۆرێك لەو شاعیرانەی کە "فارس‌و هیندو ئۆردو" بوون‌و وەسفی پێغەمبەری خۆشەویستیان ﷺ کردووە، ئاماژەی پێداوەو، هاتووە بەشان‌و باڵی زۆرێکیاندا، بەڵام ئەوەمان بیرنەچێ کە شاعیران‌و هۆنراوەچییانی کوردی بەشەرەفیش بەدەر نیین لەو هاوکێشەیەو، گەلێك پەسنییان بە خودای مەزن‌و هاوکات بە باڵای پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ گووتووە، ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە خودا خۆی بۆ خۆی چەقی عیرفانە، کە بەداخەوە زۆرێك لە شاعیران ئەو لایەنەیان فەرامۆشکردووەو دەبێت دادپەروەربین زۆرێکیش نەك بە ئاماژە بەڵکو شتانێکی زۆریان دەربارە نووسیووە، زۆرێك لەو کەڵە شاعیرانە لەناوئاخنی پەرتووکەکەدا ئاماژەم بە هۆنراوەکانیان داوە، بەڵام حەزەکەم ئەوانەشی کە ئاماژەم پێنەکردوون کەم تا زۆر لەم

---

[٧]- مشتێك

پێشەکییەدا بیانخەمە بەردیدەی ئێوەی هێژا، ئەوەتا شاعیری گەورە ((تاهیر بەگی جاف)) دەفەرمووێت:

**خۆم لەقوڕ بگرم بەجارێ هەر لەپێ تا تەوقی سەر**

**بەڵکو لوتفی شاهی لەولاک ﷺ بێ نەجاتمدا لە شین**

**ئەی حەبیبی خالیقی عالەم، تەرەححوم تا زووە**

**ئەو سەگی ئەسحابی کەهف‌و، من سەگێکی تابیعین**[8]

**روو لەقاپی موستەفا کە، بێژە یا خەیرەلبەشەر**

**نیمە تۆشەی ڕێگە، جوز ئیخلاسی ((تاهیر))ین**[9]

---

[8]- ئەم بەیتەی لە ڕۆشنایی بەیتێکی شاعیری گەورە " **شێخ ڕەزای تاڵەبانی**"دا ووتووە، کە دەڵێت:

**یا رسول الله چە باشد چون سەگ اصحاب کهف**

**داخل جنت شوم در زمرو اصاب تو**

**او رود در جنّت و من در جهنم کی رواست**

**او سگ اصحاب کهف و من سگ درگاه تو**

[9]- لە شیعری کلاسیکیدا وا باو بووە، کە شاعیران ناوی خۆیان لە زەربی شیعر یان میسرەعی دووەمی شیعردا یان میسرەعی یەکەم بێنن، لێرەشدا "تاهیر بەگ" شیرینکاری کردووە بەجیناسەوە هەم ناوی خۆی هێناوەو هەم ئالی تاهیرنی هێناوە. دیوانی (**تاهیر بەگی جاف**) حەسەن گۆران.

نالی گەورەش لە شا بەیتێكیدا ڕوودەكاتە دەرگاهی عاریفانەی خوداو فەرموویەتی:

ئەمە جێی ڕەمزو ئیشاراتی دەروونە، لە گەروویی

تەنگی پڕ غەرغەرەیی واعیزی غەڕڕا نییە باس

حەزرەتی هەیبەتە، نەك غەیبەت و ڕەیبەت (نالی)

ئەڵڵا ئەڵڵا، ع حوزوورێكە كە ئەسڵەن نییە باس

لەبەیتی دووەمدا نالی دەفەرموێت: كۆڕی زیكر كردن دەبێ حاڵ درووست بكات نەك قیلەو قاڵ، چونكە یادو موحیببەتی مەعشوق لەزوبانی دڵەوە سەرچاوە دەگرێ و ڕۆشنایی دەهاوێ، چەشنی خودا كە دەفەرموێت: ﴿ وإذا ذكر الله وجلت قلوبهم﴾ واتە: هەر كات باسی پەروەردەگاریان لەكن بكرێ، دڵیان دەكەوێتە لەرە. نالی دەڵێت: دڵ كە بوو بە عەرشی ئەو شەمەنشایە، ئیدی تێكرای خانەو شانەكانی جەستە دەكەوونە ژێر سێبەری ئەو عەرشەوە[١٠].

((قانع))ی شاعیری هەژارانیش، بە كوڵێ هەست و سۆزی نیشتمانەوەو، بە باری قورسی چەرمەسەری هەژاران و بێدەرەتانانەوە، دێتە حوزوورو

---

واتە: ئەی تاهیر ڕووبكە قاپی و كەلوەری پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و بێژە: ئەی سەروەری مەخلوقات، من جگە لەوەی دڵسۆزێكی ڕێبازەكەی تۆ نەبێت هیچی ترم لەتۆشەبەرەكەدا نییە. غولامی

[١٠]- بزوتن لەخولگەی عیشقدا، نەبەز هەورامی ١٦١.

وەسفی گەشتەكەی ئەو زاتە پیرۆزە ﷺ لە زەوییەوە بۆ ئاسمانەكان دەكاتو، دەڵێت:

چاو لەقونجانی لە زەوی، گەییە عەرشی بارەگا

دەك فیدای ناڵی بوراقت بم، كە كاری وا دەكا

هەرچی ((نامی[11]))یشە: ئەو پیاوەی كە هەموو كورد قەرزدارییەتی، لە حەجنامەكەیدا بەم چەشنە وەسفی پەیامبەری ئازیزو ﷺ مەدینەكەی دەكاتو دەڵێت:

ئەسرین بڕژێنە، بە بەر دەرگادا

ئاو پرژێن بكا، بەر دەرگاكانی

ڕابگرە بە دڵ قوببە " خەزرا"كەی

جێگەی فریشتەی پاكی ڕۆحانی

بە قوربانت بم ئەی نووری قودسی

ئەی جیلوەگاهی نووری سوبحانی

---

[11]– نازناویی زانای پایە بڵندو ئەدەبدۆست: "مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس"ی گەورەیە. غولامی

## پاسەوانێکی موخلیسی دڵ پاك

## لە بۆ ئاسانەی فەخری ئینسانی

### بەڵکو بە فەیزی ئاستانەکەت

### (نامی) سابت بێ لەسەر پەیمانی

دەزانم، چاك دەزانم، کە ئێمە لە بێ تۆییدا ئیدی بۆ دواجار کز کز دەسوتێین‌و دەبین بەقەقنەس، گەورەم حەقمانە هەرچی نەهامەتیی‌و دەردی سەری دنیا هەیە داباریێ بەسەرماندا؛ چونکە بۆ تاکە ڕۆژێکیش لەتەك دڵی سووتاو جەرگی بڕاو نزوولەو فوغانماندا بە هاوڕێیەتی تۆ کۆنە بووینەوە، تا ئەوەی ساتێك چرای دڵ‌و مۆمی بێهیممەتی ڕۆح‌و ئەندێشەی تەژی لەحەقیقەت لەگەڵدا داگیرسێنین‌و، سەر لەنوێ ڕۆحمان بدەینەوە دەستی پاکی چاکی تۆ ﷺ، زۆر بەداخەوە ئێمە کوڵی گرین‌و فرمێسکی چاو و سەراسیمەی دڵمان، دایە دەست ئەو ڕێواسە عاشقانەی کە سەرقاڵی سەر لەنوێ چێکردنەوەی خەراباتی ماڵی ڕەوان‌و سوتانی ڕەزی عاریفانەی خۆیانن، ئێمە تازە بەتازە کون بە کون‌و دۆڵ بەدۆڵ‌و کەلێن بەکەلێن، کنەمانەو ماخۆلانی دەوروپشتی ئەو دوژمن‌و پشتکردوانەین کە بۆ جارێکیش سەرباری بینینی نووری جەماڵی تۆ، گەر بەچاویش بێ دانیان بە پێغەمبەرایەتی ﷺ تۆدا نەنا، ئەو ئەبوجەهل‌و ئەبولەهەبانەو ئەمسالی ئەوانیش، بۆ تەنها جارێك لەخۆیان ڕانەمان‌و بەکوێرە دڵی خۆیانیان نەووت: ئەرێ پیاوی

حیسابی؛ ئاخۆ دەگونجێ ئێمە موحەممەد لەماڵەکەی، لە شوێن‌و مەنزڵگەکەی، یان ڕاستر بڵێم لەو شوێنەی بووە بە مەنزڵگای یەکەمین حیکمەتی جاویدانی‌و مەهبەتی نیگای، شاربەدەریکەین‌و کەچی سەرباری ئەوەش ئاڵتون‌و زێڕو سامانەکەمان لەکن ئەو زاتە ﷺ پاکە چاکە سەلارە وەك سپاردە دابنێین ؟ ئاخۆ کەینگێ شتی وەها لە دیرۆکی مرۆییدا ڕوویداوە، کەکەسێ شاربەدەرتکا، کەچی لەهەمبەر ئەو کردەوەدا ئەتۆ بە چاکەو ئاکاری قەشەنگەوە لەقەرەی بێیت؟! بەڵێ ئێمە شوێنی ئەو دڵمردووانە کەوتین‌و بەنان‌و خوانی ئەوان ڕازی بووین پشتمان لەتۆ ﷺ کرد، ئێمەیەك کە بەدرێژایی ژیانت بۆ یەکجاریش دڵخۆشمان نەکردیت، ساتێك نەمانهێشت لەم سەفەرە پڕوکێنەی دنیا بحەوێیتەوە، دەمێك ئاوی حەیاتمان نەکرد بە گەرویی پیرۆزتدا، بۆ چرکەیەکیش دوای کۆچی پێشەوا حەمزە دڵی بەئازاری تۆمان نەدایەوە، تەنانەت گەر بە ڕستەیەکیش بێ بەو کرێوەو گەردەلوولەی کوفرمان نەووت: لەسەر پەڕەی گوڵێك نووسراوە هەڵی مەوەرێنن. بەڵام چیبکەین، ئەم کاڵفامانە خوێندەواریان نەبوو، هیچیان نەدەخوێندەوە، نەدەچوون گەر هێندەی ماوەی وەنەوزی منداڵێکی هاروهاجی ساهیریش بێ، پێی بڵێن: ئەدی بۆ نووسراوی سەر ئەو پەڕە گوڵانە ناخوێننەوە؟ بەڵێ وەك ئەوەی ئێمە نەمانەوێ بۆ هاتاهەتایە بە ئارامی ووچانێك بدەیت، تۆیەك کەهەمیشە لەخەمی ئاوابوونی ئەستێرەی ئیمانی ئێمە بوویت، تۆیەك کە هەردەم ((امتی امتی)) لە دەمی پیرۆزت بۆ ئەم ئوممەتە بێهیممەتەی کە دائیم بە ئەحزانە، دەهاتە دەرەوە. قوربان ﷺ دەبایە ئێمەش بەو وەجدەوەو بەهەمان ئەو خەمەی

حودەیبییەوەو ئەو دەردو خەفەتەی عامی حوزنەوە، بە تێکرای دوژمنانمان گوتبایە: ئەدی نازانن ئەو سەییدی مەخلوقاتە، مەنزڵگای کەرەمو وەفایە، قەتماغەی برینەکانە، مەهبەتی نیگایە، حەبیبی خاوەنی عەرشی خودایە، چێکەرەوەی خەراباتی دڵی شەیدایە ؟ بۆ نەتانزانیوە کە تکاکاری ڕۆژی مەحشەر ئەوە ﷺ، کڕنووشبەری بەردەمی پەروەردگار ئەوە ﷺ، شافیعی موزنیبین ئەوە ﷺ، خاتەمی مورسەلین ئەوە ﷺ، خۆشەویستی دڵی بیلالﷺ کە هیلالانە هەڵهات[12] ئەوە ﷺ، خەمرەوێنی دڵی عەممارﷺ ئەوە ﷺ، هەر ئەوە ﷺ لە بەدرا داكو بابی قوربانی کوڕی ئەبو وەققاس دەکات، سەییدی سادات ئەوە ﷺ، دڵدەرەوەی دڵی خەبابو خوبەیب ﷺ ئەوەﷺ، بەڵێ نازداری تێکرای دڵە شەیداکان ئەوەﷺ.

قوربان ﷺ ئیدی من قسەکانم کە لەهەمبەر تۆدا شەرمیش دەکەم نەك قسە بەڵکو بڵێم وەسف یان پەسن، وورده وورده خۆری بەرەو ئاوابوون دەچیٚو دەپسیٚ، من ناتوانم لەم چەن دێڕەدا بڵێم باسی تۆم کردووە، ئەوەندە نەبیٚ کە تنۆکێکم لە دەریایەك، دێڕێکم لە

---

[12] – ئاماژەیە بۆ ئەو هونراوە چوارینەی نالی یە کە دە فەرموێت:

هەرچەندە کە من عەبدمو ڕوو زەردمو عاسیم

مەئموله خەلاسیم

قوربانی بیلالم کە هیلالانە هەڵاتووم

هەر عەفووە خەڵاتم غولامی

کتێوخانەیەك، یان خاڵێکم لە پەرتووکێك باس کردووە، چونکە زۆرن ئەوانەی بەبۆنەی باسی تۆوە گەورە بوونو پێگەشتنو تێگەشتن، وەك ئەو کەڵە پیاوانەی کورد کە پێشتر باسمان لێوە کردنو بە چەند دێرێکی کرچو کاڵ نەك بە تێرو تەسەلی، هاتم بە وێژەیاندا چونکە تەنانەت نەك هەر پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بەڵکو نەمتوانی بە تەواوی باسی ئەو شاعیرانەش بکەم کە هۆنراوەو پەخشانیان بۆ ئەو زاتە ﷺ پیرۆزە چریوەو لە گوڵقاری غەزەلی خۆیاندا شیعریان بۆ نووسیوە، ئیدی یەك لەدوای یەكو هەر کەس بەجارێ لەم پیاوە گەورانە، هاتوونو پەسنی پێغەمبەری خۆشەویستیان ﷺ کردووە. وەك غەمباری شاعیر لەدەستپێکی کۆرە شیعرێکی دەربارەی ئەم کەڵە شاعیرانەی خۆمان دەکەوێتە قسەو منیش لەم کۆتاییەدا ئامارەی پێدەکەمو هەنیدێکیشم بۆ زیادکردووەو، کە پێش هەموو شتێ بە هۆنراوەیەکی مەحوی دەست پێدەکاتو دەڵێت:

**هەر گفتوگۆمە، کەچی هەر دەڵێمو تێناگەم**

**هەر جستوجۆمە، کەچی هەر دەڕۆمو پێناگەم**

چاووم ڕوواو گۆشەی ئەو ئەبرووەم نەدی

دڵ بوو بە بەحری علوومو لە ئەلف و بێ ناگەم[١٢]

ئازیزانم ئەی عاشقانی ووشەو هەستو سۆزی عاریفانەی حەزرەتی **مەحوی**، ئەی شەیدایانو چاو لەڕێیانی ماڵە چۆڵو غەریبەکەی **نالی**، ئەی ئەوانەی هەتا ئێستاش لەگەڵ **سالما**، دڵتان خەفەتخانەی ئاوابوونی ئەستێرەی ئەمارەتەکەی **بابانە**. ئەی ئەوانەی گەر بۆ ساتێکیش وەسفی **مەولەویی** سەنگینتان کردبێت، واتان زانیوە گەرەترین ستەمتان لەو زاتە مەزنە کردوە، ئەی گەڕیدەکانی کووچەو کۆڵانی شیعری موستەفا بەگی **کوردی** گەورە، دواجار ئەی سالیکانی تەریقەتە نازدارەکەی **بێخود**، ئەزیزانم بە بارانێك سڵاوەوەو، باوەشێك مووحیبەتەوە پێتان دەڵێم: ئیدی فەرموون، بەرۆحتان چەشکە ببەن بە خوێندنەوەی ئەم پەرتوکەی کە تەژییە لە عیشقو وەفاو خۆشەویستی بۆ ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەو ﷺ. بۆ دواجار هەمان ئەو دێڕ بەپێزەی ***نالی*** گەورەتان پێشکەش دەکەم کە فەرموویەتی:

---

[١٢]- واتە زۆرێك باسی خوداو پێغەمبەرانو پیاوە مەزنەکانم خوێندو خوێندەوەو چاوویش بە دەست موتاڵاکردنەوە تروسکایی تیا نەما، بەڵام دواجار هێندە دەریای عیرفانو زانستی بێبنی ئەوان قووڵ بوون هیچی لێحاڵی نەبووم، واتە وەك ئەوەی هیچم نەخوێندبێتەوە. غولامی

گەشتێکی عیرفانی.................................. غولامی

دائیم لە حەزەردا سەفەری بە، لە وەتەندا

غوربەتکەش و عاجز بە، ئەگەر ئەهلی تەریقی


زانا ناجی غولامی

خوێندکاری ماستەر لە " العقیدة والادیان "/ زانکۆی سلێمانی

Zananaje٥@Gmail.com


١٤/ ٤/ ٢٤١٤

***

## ئەو پەرتووکەی هەرگیز لەیادی ناکەم[١٤]

[illegible] دەربارەی پەرتووکێك دەدوێم! کە ئەمیستاش فەزڵو گەورەیی بەسەرمەوە هەیەو، لەمبەلەمیش ڕەحمەت لەنێرم بۆ خاوەنەکەی، کە لەڕێگەیەوە دوای ئیمان بەنرخترین دیاری پێشکەش کردم، بەڵکو دەتوانم بڵێم ئەو پەرتووکە بوو بە بەشێك لەبەشەکانی ئیمانم، ئەویش لە ژیانی پێغەمبەری ئازیزدا (د.خ) خۆی دەبینێتەوە، کە **"قازی سلێمان ئەلمەنسوور فوورییە** (ڕەحمەتی خودای لێبێت)"دایناوە، خۆی بۆخۆی ئەم پەرتوکەش بەسەرماتێکی سەرسوڕهێنەری هەیە.

---

[١٤]– ئەڵقەیەك لەزنجیرە ئەڵقەی ( ئەو پەرتتوکانەی کە تێیدا ژیاووم) کە نووسەر بو ڕۆژنامەی بەعسی ئیسلامی نووسیوە، وەرگێراوە. دانەر

برا گەورەکەم[١٥] – کە دوای کۆچی باوکم بەخێوکردنو پەروەردەکردنی منی گرتە ئەستۆ، لەکاتێکدا هێشتا تەمەنم نۆ ساڵان بوو- زۆر سەرکەوتوو بوو لە هەڵبژاردنی ئەو پەرتووکانەی کە پێویست بوو لەو تەمەنەدا بیانخوێنمەوە، یەکەم کتێبیش پێشکەشی کردم ( سيرة خير البشر)ی دانراوی "هیندیی" بوو، ئەو بەردەوام جەختی لەوە دەکردەوە کە من زیاتر سەرقاڵی خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری ئازیز بم، چونکە زۆر چاك هەستی بەوە دەکرد کە ژیانی ئەو سەروەرە کاریگەرترین هۆیە بۆ پێگەشتنو پێکەوتنی بیروباوەڕو چاندنی ڕووەکی باوەڕو چرۆی خوڕەوشت لەمرۆڤدا، کە بێگومان منیش هەردەم لەسەر خۆشەویستی پەرتووکی مێژوو و موتاڵاکردنو کۆکرنەوەیان گۆشکراوم.

جارێکیان چاوم بە پەرتووکی ( رحمة للعالمين)دا خشاندو تەماشایی نێوەڕۆكو سەرباسەکانیم دەکرد، لەدەروونمدا تاسەیەکی لەڕادەبەدەرم لەلا دروست بوو، بۆیە داوای ئەو کتێبەم کرد – کە ئەو کات دوو بەشی لێ چاپکرابوو –، تەمەنیشم دە پانزە ساڵان بوو و ئەوەندەش پارەم پێنەبوو کە بەشی کڕینی ئەو پەرتووکە بکات، بەڵام منداڵان – بەتایبەت ئەو سەردەمەی من لێی دەدوێم – ملکەچی یاساکانی بودجەو زانستی ئابووری نابنو هەرچییەك ڕوویدا ئەوان هەر لەسەر بەزمی خۆیاننو داوای پارەدەکەن، بێگومان ئەوەش فیترەتی

---

[١٥]– دکتۆر عەبدولعەلی حوسنییە، کە بەڕێوەبەری کۆری لەکهەنوویی هیندە، کەبەرواری ٢٧ زیلقەعیدەی ١٣٨٠ك کۆچی دوایی کردووە. دانەر

منداڵانە، دواتر ئەو پۆستەچییەی کە کتێبی بۆ گوندە بچوکەکەمان دەهێناو دەبرد، هەمان پەرتووکی لەتەك خۆیدا هەڵگرتبوو کە من تاسەییم دەکرد، بەڵام هەرکات بیرم لەگیرفانی بەتاڵم دەکردەوە دەمزانی کە سەرکەشی دەکەمو بەشی کڕینی ئەو پەرتووکەم پێنییە؛ بۆیە دایکم[١٦] - خودا لێی رازی بێت - سەرباری ئەوەی گەلێکی پێناخۆش بوو دڵی کوڕە بێباوکەکەی بشکێنێتو زۆر پۆزشی بۆ هێنامەوەو تەنانەت لەبەر ئەوەش کە لەو دەمەدا دایکم گەلێك هەژار بوو، وتی ڕۆڵە گیان باوەڕ بکە بەشی کرینی پەرتووکەکەتم پێ نییە، هەرکاتێکیش سەیرێکم لەدەورووپشتی خۆم دەکرد، دەمزانی هیچ تکاکارێکم نییە بەهانامەوە بێت، جگە لەو تکاکارەی کە منداڵان پەنای بۆ دەبەنو تکای خۆیانی لا دەکەن چونکە زۆر باش دەزانن کە ئەو تکایە هەرگیز پەرچ نادرێتەوە، ئەویش تەنها گریانو سۆمای بەخووڕی چاوانەو لالانەوەی بەردەوامە، کە هەر سۆمای چاوانی هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەر (د.خ) (**عومەیری کوڕی ئەبول وەققاسە**) بوو، تکای لە پێغەمبەری ئازیز (د.خ) کرد هەتا لەجەنگی بەدردا بەشداری پێ بکات، کە دواجار بەهۆی سکاڵای فرمێسکە لەدیدە قەتیسکراوەکانییەوە داواکەی قەبوڵ کرد، منیش بەهەمان تکاو ئەسرینەوە لەدایکم پاڕامەوەو گەلێك گریام؛ بۆیە

---

[١٦]- دایکی ئازیزم دوابەدوای نووسینی ئەم نووسراوە لە ٦ جەمادی دووەمی ١٣٨٨ك بەیەکجاری دونیای بەجێهێشت، خودا لێی خوش بێ لە ئافرەتە کەڵە هەرەچاکەکان بوو هاوکات تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو سەرباری ئەوەش زۆرجار شیعری دەچریو دیوانە شیعرێکیشی هەبوو. دانەر

دڵی دایکم نەرم بوو و زۆر هەوڵ‌و کۆششی کرد هەتا ئەو برە پارەی پەیدا کردوو کتێبەکەی بۆ کڕیم، دەستم کرد بەخوێندنەوەیی‌و ووردەووردە دڵی هێنامە کوڵین‌و بزواندمی، نەك بزوانێکی بێزارکەر؛ بەڵکو نەرم نەرم لەدەروازەی دڵی دەدام‌و دەم بەدەم لەتەك ڕووداوەکانی نێو پەرتووکەکەدا دەیهێنام‌و دەیبردم، ئەوەش ئەو جیاوازییەیە کە لەنێوان بزوانی دانانی پەرتووکێکدا بەدی دەکرێ کە دەربارەی ژیانی پیاوە پاڵەوان‌و ئەفسانەکان دانراوەو لەنێوان بزوانی ئەو پەرتووکانەش کە دەربارەی ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست دانراوە، کە یەکەمیان لەرزینێکی دڵبێزارکەرەو ئەوی دووەمیان لەدەروونەوە هەڵدەقوڵێ‌و بۆن‌و بەرامەی خۆشی لێوە دەردەچێت.

بار بار دەروونم وەك ئەوەی پەیمانی لەگەڵ بەستبێت، سەرقاڵی وەڵامدانەوەی وشە بە وشەی ئەو پەرتووکە بوو، هاوکات لەساتی خوێندنەوەیدا چێژێکی لەڕادەبەدەرم دەبرد، جوودا لەتەك کۆی ئەو چێژانەی لەدەمی منداڵیمدا کردبووم، کە نە لەززەتی خواردنی بەتامی لەکاتی برسێتیداو، نە چێژی لەبەر کردنی پۆشاکی نوێ لەساتی جەژنێداو، نە تاسەی ئەو یارییەش کە تەماشای دەکەیت‌و سەرباری سەرکەوتنەکەشی گەلێك حەزت لێیەو، نە تامەزرۆیی ئەو پشووانەی دوابەدوای تەواوبوونی وەرزی خوێندنی سەرەتایی وەریدەگریت‌و، نە تامەزرۆی دیتنەوەی ئەو هاوڕێیەی دەمێکە چاوەڕوانی بینینەوەیت‌و چاوان هەردەم بازرەقەی بەستووە بۆ دیداری‌و، نە سەردان‌و زیارەتی تێکڕای ئەو میوانە سەخاوەتمەندو گوستاخانەش لەتاو خوێندنەوی

ئەو پەرتووکەدا، بەهیچ کلۆجێك پێناگاتو تەنانەت ناتوانن خۆیان لەقەرەی ئەو لەززەتە بدەن کە من لێم بردبوو؛ چونکە چێژێکی وەها بوو کە دەتوانم باسی تامەکەیت بۆ بکەم بەڵام پەسنو وەسفی هەرگیز ناتوانم بکەم، ئەمێستاش دوای تێپەربوونی ساڵەهای ساڵ بەدوای خوێندنەوەیدا وشەیەکم وەچنگ ناکەوێت تا بتوانم بەهۆیەوە تامەزرۆیی خۆمی بۆ دەربرم، بەڵام گەر کەمترین پەسنێك بیڵێم دەربارەی ئەوەیە کە بەڕاستی: " ئەوە چێژێکی ڕۆح ئاسابوو" ئیدی ئایا منالان دارای ئەو ڕۆحە نین ؟ یانەخۆ هەستی پێناکەن؟ نا بەخوا ! باوەڕ بفەرموون منداڵان دارای ناسکترینو ناوازەترین رۆحو هەستن، با دەستەوەسانیش بن لە شێوەی دەربڕینیدا.

لەو پەرتووکە سەرسورهێنەرە بزواوەدا هەواڵی ئەو قورەیشیانەم دەخوێندەوە کە باوەڕیان هێنابوو و چۆن بەو هەموو چەشنە ئازاریان دەدانو نرکەو ناڵەیان دەباران بەسەریاندا، بەڵام سەرباری ئەو هەمە ئازارانە ئەوان بەردەوام ئارامگربوونو چێژێکی لەرادەبەدەر دەروونی داگرتبوون، ئیدی ئەو دەمە هەستم کرد لەنێو ناخو دەروونی مرۆڤدا لەززەتێکی دیکە هەیە کە نەپارەدارانو نەزلهێزەکانی دونیا هەستی پێناکەن، تەنانەت زۆرێك لەوانەش کە لەم دونیایەدا لەو پەڕی خۆشبەختیدا ژین دەگوزەرێنن، هەستی پێ ناکەن، بەڵێ؛ ئەوانە کەسانێك بوون کەلەسەر حەق لێیان دەدراو سوکایەتیان پێدەکراو، وەك وتمان ئەو خۆشیو لەززەتەی ئەوان بەهۆی ئیمانو بیروباوەرەکەیانەوە دەیان چەشت، بەهیچ کلۆجێك لەززەتو چێژی

هێزی سەرکەوتن‌و پلەو پایەی پێناگات، بۆیە لەساتی خوێندنەوەیدا دەمبینی کە دەروونم بەئاواتەوەیە لەتەمەنیدا گەر بۆ جارێکیش بێت لەرزەتێکی لەو چەشنەی تامکردبایە.

دوابەدوای کەمێك؛ هاتمە سەر باس‌و سەرگوزەشتەی هاوەڵی بەرزو خۆشەویست (**موسعەبی کوڕی عومەیر**) -خودا لێی رازی بێت- ئەو موسعەبەی کە بە ڕێکپۆشترین‌و خۆشخۆرترین‌و قەشەنگترین‌و دەوڵەمەندیی بەنێوبانگ بوو، ئەو **موسعەبەی** هەرکات لەمەککەوە وەدەردەکەوت، پۆشاکێکی لەبەر دەکرد کەبە سەد دیرهەمی ئەو دەمە مەزەندە دەکراو، تەنانەت کروکاڵ‌و منداڵانی مەککەش شوێنی دەکەوتن‌و دەبووە سەرباس‌و ئاخافتی ئەو کۆمەڵ‌و تاقمەیە، دواتر ئەوە موسعەب بوو کە دەستی لەنێو دەستی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) داناو خۆی لەهەموو خۆشییە کۆتاکانی دونیا کردو پشتی لێکردن‌و خۆی خزاندە نێو ژیانێکی تەنگ‌و چەڵەمەو ناهەموارەوە، ئەو موسعەبەی پۆشاکەکانی وای لێهاتبوو کە دڕك‌و داڵی مەدینەی لێئاڵسکا بوو، ئیدی ئەم دیمەنەی موسعەب گەلێك پێغەمبەری ئازیزی (د.خ) ئازارداو لەتاودا دەستی کرد بە گریان‌و ڕۆندك لەچاوە پیرۆزەکانی قەتیس مابوو، ئەو سەردەمانەی بەبیر خۆی دەهێنایەوە کە موسعەب لەچ ژیان‌و گوزەرانێکدا بووە‌و ئێستاش لە بەر خوداو پێغەمبەرە ئازیزەکەی (د.خ) لە چ ژیانێکدایە !! کەچی ئەوا سەرمەشقی لاوانی مەدینە لەجەنگی (**ئوحود**) دا شەهید دەبێ‌و لەدوای خۆی جگە لەپارچە قوماشێك نەبێ - کە سەریان پێدادەپۆشی قاچی وەدەردەکەوت‌و تا قاچیان دادەپۆشی

سەری دەردەکەوت- هیچی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت، تا پێغەمبەری ئازیز (د.خ) فەرمووی: "سەری بەقوماشەکە دابپۆشن‌و قاچەکانیشی بەڕووەکی ( ئیزخیری) بۆن خۆش".

پشتی خوێندنەوەی ئەو چیرۆکەی موسعەب دڵم توند گرت‌و دەروونم دیل کرد، زۆر باش هەستم بەوە کرد لەپشت ژیانی خۆش‌و پۆشاکی قەشەنگ‌و خواردنی جۆراوجۆرو کۆشک‌و تەلاری بەرزو بڵندەوە، شتگەلێکی دیکە هەیە کە سەرمایەداران‌و پادشایانی دونیا لەهەمبەریدا دەستەوەسان‌و بێتەوانن، هاوکات لەززەتێکی تریش هەیە کە لەززەتپەرستان‌و ئارەزوبازان لێی بێئاگان، کە پێداچوونەوەیەکم بەدڵ‌و دەروونی خۆمدا کرد هەستم کرد کە ئەویش بەهەمان چەشن عەودالی دەستگیر بوونی وەها لەززەتێکەو زیاتر هەوڵ‌و تەقالا بۆ ئەو لەززەتە عیرفانییە بێهاوتا ڕاستەقینەیە دەدات، نەك بەرگ‌و پۆشاکی دەوڵەمەندان‌و پادشایان‌و سەرمایەدارانی هیچ لەبارو بنەدا نەبوو.

پاش کەمێکی دیکە دەستم کرد بە خوێندنەوەو موتالاکردنی چیرۆکی کۆچی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) کە هێندە لەززەتی عیرفانی‌و چێژی لەڕادەبەدەرم لەو چیرۆکە کرد، باوەڕ ناکەم بەدرێژایی ژیانم سەرگوزەشتەیەکی کاریگەرترو پڕ واتاترو ناوازەتر، هەم لەرووی دارشتن‌و چۆنییەتی نووسینی چیرۆکەکەو هەمیش دەربارەی کاریگەری رووداوە پڕ لەپەندو مۆچیارییەکانییەوە خوێندبێتەوە، کە نووسەر بەچەشنێکی سادەو ساکاری ناوازە نووسیویەتی‌و هۆنیویەتییەوە.

لەدەمی چوونە ژوورەوەی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) لەدەروازەی مەدینەوە، بەیەکجاری دڵەکان تامەزرۆی دەبن و چاوانیش بەدیتنی گەشدەبنەوەو هەموو هۆزو تیرەکان تاقم تاقم دێنە پیری خۆی و هاوەڵە بەرێزەکەیەو میوانداری لێدەکەن، بەچەشنێك کەراستگۆیی و دڵسۆزیی بەقسەو گفتوگۆکانیانەوە لەسەر تەختی دەم وچاویان نما بوو؛ ئەی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) -دایك و بابمان قوربانت بێت- با لەخزمەتدا بین، تامەزرۆی میوانداری کردنین لەجەنابتان، پێغەمبەری ئازیز (د.خ) فەرمووی:" وازی لێبێنن خۆی فەرمان پێکراوە"، دواتر ووشترەکە لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەی ئێستایدا چوارپەلی داژەندو، هەڵنەستایەوە تا ئەو شەرەف و گەورەییەی کە هیچ شەرەفێك لەسەرییەوە نییە بەخشرایە [ئەبو ئەییووبی ئەنساریی (ر.خ)] و ئەویش بەکامەرانی و بەهەمان سۆزو وەجنی جارانەوە، کۆڵ و بارەکەی پێغەمبەری ئازیزی (د.خ) هەڵگرت و بردییە ماڵەکەی، ئەو دەمەی سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەو خۆشی لەززەتەی ئەبو ئەییوب (ر.خ) بووم، ئەو کات هۆشم هاتەوە بەرخۆم و زانیم لەتەك ووشترەکەی پێغەمبەری ئازیزو (د.خ) کاروانەکەی بووم بەهاوڕێ و وورده وورده منیش لەدوایانەوە داخڵی مەدینە دەبم، ئەزیزانم باوەر بفەرموون وامدەزانی تێکرای ئەوانە بەچاوی خۆم دەبینم، وامدەزانی هەتا ئەو تەمەنەی ژیانم هەرشتێکم دەربارەی گەڕانەوەی دەوڵەمەندان و گەورە پیاوان و فاتیحەکان خوێندۆتەوە، سات بەسات هەموویانم لەبەرچاو دەپسێ و نەحیف دەبێتەوە، هاوکات ئەوەشی دەربارەی خۆشەویستی و دڵسۆزی کەسێ بۆ کەسێکی دی زانیوومە، دەم بەدەم دەتووێتەوەو لەبەرچاووم

وون دەبێ، ئیدی ئەم دیمەنە بۆ هەتا هەتایە لەسەرتەختی دڵم نەخشی کێشاو، تێکڕای ئەوانەم لەبەر دیدە لەتاو چیرۆکی بەرزی پێغەمبەری ئازیز(د.خ)وەك سێبەری لەبەر خۆر کەوتوو بەسەر دەچێت، بەچەشنی "مەحوی" گەورە شاعیریش لەشابەیتێکا دیمەنی عیشقو خۆشەویستی خۆی بۆ دڵدارو ئەزیزەکەی دەردەخاتو دەکەوێتە وەسفو پەسن کردنیو دەفەرموێت:

وەکو ڕۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەووت

لەمێوە ئەشكو ئاهی ئێمە سەرکەووت

کە ئەو لێو ددانەم دی بەجـــــــاری

لەبەرچاووم هەموو لەعلو گوهەر کەووت[17]

وەنەوزێکم شەوێدا گەییە سەرمو ووتی

هــەستە هەتاووت وا لەسەر کـــــەووت

لە کێ یارەب خەبەر پرسی بکەم من؛ کە

هەر کەس بۆ خەبەر چوو بێ خەبەر کەووت

---

[17]- لەعل: لێو. گوهەر: گەوهەر. غولامی

دڵم وەك شێری بێشەی شوعلە گرتوو

لەسینەی پر لەسۆزم دەربەدەر کەووت

بــــەخۆرایی ئەمـــــەندەم ناڵە کێشا

لە سینەمدا، پسا، ما، بێ ئەسەر کەووت

بڕۆی ئەو شۆخە ئەمڕۆ تیری کێشا

نەجاتی دا بەرەحمەت هەرچی بەرکەووت

بــــەپیر ئەو ڕۆژەوە "مەحوی" ئەوەندە

بەسەر چوو بوو، وەکو شەونم لەسەر کەووت

دواتر چوومە سەر چیرۆکی جەنگی ( ئوحود)، چیرۆکێك ئەمێستاش مێژوو بەخۆیەوە سەرسوڕهێنترو جوانتر هەم لەرووی دڵسۆزیو وەفاداریو هەمیش پاڵەوانێتیو باوەرو یەقینو ئاکاری جوانەوە بەخۆوە نەدیبوو، لەو ساتەدا ئەو ووتەیەی ( ئەنەسی کوری نەزرﷺ)) رایتەکاندم، لەهەمبەر ئەوانەدا کە دەستەوەسان ببوونو لێیدانیشتبوونو هەرچییەکیشیان بەدەستەوە بوو فرەیاندابوو ئەنجامیدا، ووتیان پێغەمبەری خودا (د.خ)شەهید بووە، ئەنەسیش فەرمووی: " کەوابوو گەر پێغەمبەری خودا (د.خ)لەدونیا دەرچوو بێت،

ئێوە دوای ئەمڕۆ چ کارێکتان بەدونیاوە دەمێنێ؟، دەبێت ئێوەش بەچەشنی ئەو لەپێناوی ئەوەدا فەوت بکەن کە ئەو فەوتی کردووەو گیانی بەخت کردووە" دواتر بەچەشنی ئەوی پێشوو، ووتەی ئەو هاوەڵە بەرێزەش رایچڵەکاندم کە دەیفەرموو:" من لەقەدپاڵەکانی ( ئوحود)ەوە بۆن و بەرامەی بەهەشتم بۆ دێ"، هاوکات ووتەی ئەو هاوەڵەش کە لەدوا ساتەکانی گیانەلادا بوو و بەئاواتەوە بوو دواساتی تەمەنی، گەشتن بێت بەدیداری پێغەمبەری خودا (د.خ)تەزوی بەگیانمدا هێنا، کە هەڵیان گرت و هێنایانە بەردەمی پێغەمبەری خوداو (د.خ) دواهەناسەی خودا حافیزی لەم دونیا دەرکرد، لەهەمان کاتدا دیمەنی( ئەبو دوجانەم ﷺ) کەوتە بەرچاو، کە چۆن چۆنی خۆی کردووە بەقەڵغان بۆ پێغەمەری ئازیزﷺ و لەو کاتەدا خۆی دەداتە بەر ئەو تیرەی کە بەر پشتی دەکەوێت. ئەوەش سەرباری ئەو هەموو فەرمایشتانەی کە دەربارەی خۆشەویستی و گیانفیدایی هاوەڵان بۆ پێغەمەری ئازیز (د.خ) باسی لێوە دەکات، بەڵێ؛ بەم چەشنە بەردەوامیم دەدا بەخوێندنەوەی ئەو پەرتووکە، بەئەندازەیەك لە زۆر شوێندا کوڵی گریانی بۆ دەهێنام و جاری واش هەبوو خۆشی هەموو جەستەی دادەگرتم.

بێگومان چاکەی ئەو پەرتووکەو خاوەنەکەشی کە بوە هۆی ئەوەی هەرگیز لەیادیان نەکەم ئەوەبوو، کە ئەوان لەززەت و چێژێکیان لە دڵمدا ساز کرد کە ژیان بێ ئەوە لەززەتە هیچ ماناو بەهایەکی نییە، وەك شاعیری فارسی ئەمیر خوسرەو دەڵێت:" خودا ئەو رۆژە لەنێو ببات کە بەبێ چەشتنی چێژو لەززەت تێیدەپەڕێنم، دەك موبارەك نەبێ

ئەو ڕۆژەی بەبێ هەڵکردنی کزە بای خۆشەویستی دەیگوزەرێنم، پەراگەندەو دوریی بێ لەو ژیانەی کە تێکرای بە باس‌و خواسی ژیربێژیی‌و مەنتیقەوە بەسەر دەبەم".

بێگومان خۆشەویستی دەست مایەو کرۆکی ژیانە، چەندە جوانی فەرمووە ئەو کەسەی کە دەڵێت: " ئەو دەمەی تەماشای ئەم جیهانەم دەکرد، وەك خەرمانێکی بەرفراوان دەهات پێشچاووم‌و، دەبینم کە تەنها دانەو تۆو تێیدا ( خۆشەویستی) یەو ئەوانی دیکە کاو پوش‌و پەڵاشی دەم بان".

ئەوە ئەو خۆشەویستیەیە کە لەنێوەندی هاووێنەو هاوکوفەکان بووە بەئیمتیاز بۆ زۆرێك لە پاڵەوانان‌و پیاوە مەزن‌و پیتۆڵەکان، هاوکات زۆرێك خەڵك بەهۆیەوە- بەلاوازو مامناوەندیەوە- چەندین سەدە بەدیار وشەی خۆشەویستییەوە ژینیان گوزەر کردووە، هەروەها چەندان شوێنەواری بەدوی خۆیدا بەجێهێشت کە بەهێزترین‌و دەوڵەمەندترینی کەسان دەستەوەسان بوون لەبەرهەمهێنانی، بۆیە هەندێ لەوانەی ئەو خۆشەویستییەیان تام کرد گەلێکیان دەستگیر بوو، بۆیە ئەو گەلەش توانی جیهان بگرێتە دەست.

ئەوە ئەو خۆشەویستیەیە کە لەم چەرخانەی دواییدا ئەم گەلەی مایە پووچ کردبوو، گەلێك کە دارای سەرمایەو داهاتێکی بێوێنە

بوو، بەڵام لە ئیكسیرو[18] دەستەبەر كردنی ژیان مایە پووچ بوو، بەرادەیەك وای لێهات بوو بووە جەستەیەكی مردوو و كە ژیان ببووە بارێكی قورسی سەر شانی.

ئەوەیە ئەو خۆشەویستییەی كە مەزنترین چینی مایەپووچ تێیدا، ئەو چینە هاوچەرخە فێرخوازەی ئەم گەلە بوو، كە خاوەنی رۆحێكی بۆش‌و بەرهەڵستكارێكی لاوازو دارای وەزنێكی سووك‌و ژیانێكی لێڵ‌و كردارێكی خوارو خێچ نەبێ هیچی تری لەبارگەدا نەبوو.

دووبارە سوپاسگوزاری ئەو پەرتووكەم كە بەچەشنێكی سەراسیمەكەر بزواندمی‌و هەستێكی زیندووی كردەوە بەبەرمدا، هەستێك كەپری بوو لە لەواتی خۆشەویستیی، هاوكات گەلێك سوپاسی دەكەم كە زانی چۆن چۆنی ئەو خۆشەویستییە قەتیسكراوەی دەروونم ئاراستە بكاو تێكرای واتاو مانای جوانی‌و (بێخوود) واتەنی حوسنی تەماشای تێدا وێنا بكات، كە بێگومان ئەو ئاراستە كراوەش، ئەو كەسەیە كە خودا لەو جوانترو نوازەترو قەشەنگتری نەفراندووە هەم لەرووی ناوازەی سیرەت‌و هەمیش سورەتەوە.

بێگومان كارەساتی ئەم ئومەتە بێئومێدە، ئەوەیە كەپەیوەندی لەتەك دڵدا پچراندووەو لە چێژی خۆشەویستی خۆی بێبەش‌و تەواس كردووە، وەك موحەممەد **ئیقباڵی** گەورە شاعیری ئیسلام دەفەرموێت:"

---

[18]- ئیكسیر: ئەو خۆڵەیە كە كیمیاگەرەكان ئەیكەنە ناو مسەوەو ئەبێ بەزێر. غولامی

**فەتارەتی موسوڵمانانی ئەم دەمە ئەوەیە هەڵگری دڵانێکن کە مەحبووب نەناسیۆ، دلرای ماددەی خۆشەویستین، بەڵام نازانن سەرقاڵیکەن بە چ کەسێکەوەو ئاراستەی کێی بکەن".**

ئەی (**قازی سلێمان ئەلمەنسوور فووریی**) سڵاوی خودات لێبێت، بەڕاستی لەم پەرتووکەتدا، دوو نیعمەتم دۆزییەوە کە بەهیچ نیعمەتێکی ناگۆڕمەوە، ئەوانیش: نیعمەتی خۆشەویستییەکی پاكو بێگەردو، نیعمەتێکیش کە ئامانجەکەی ڕاستو دروستە، ئای چەندە نیعمەتانێکی مەزنن.

## موحەممەد ئیقبال لەشاری سالارەکەی مەدینە ﷺ[19]

دکتۆرو فەیلەسووف چەرخ‌و شاعیری ئیسلام ( موحەممەد ئیقبال) بەدرێژایی ماوەی ژیانی سەرقاڵی خۆشەویستی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) و سۆزو شەوقی مەدینەکەی وی بووەو، هەردەم هۆنراوەی بەبالای هەم زاتی پاکی (د.خ) و، هەمیش مەدینەکەیدا چڕیوە، بەڕادەیەك لەدوا ساتەکانی تەمەنیدا جامی شەوقی ڕژا، ئەوەبوو هەر کات باسی مەدینە بکرابایە فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس دەماو دەکەوتە گریەو نزوله، بەڵام بەهۆی لاوازی لاشەو جەستەی بیمارییەوە کە دەمێك بوو دووچاری بووبووەوە نەیدەتوانی زیارەتی پێغەمبەری ئازیز(د.خ)بکات، بەڵام بە خەیاڵ‌و ئەندێشە بەهێزەکەیەوەو بە هۆنراوە بەپیت‌و پاراوەکەیەوەو بە دڵە پڕ سوێ و سۆزو تاسەمەندەکەیەوە،

[19] - ئەم قسەیەم لە وێستگەی دیمەشق ساڵی ١٩٥٦ ز بڵاوکردەوە. دانەر

سەفەری دەکرد بۆ حیجازو لە ئاسمانیدا لەشەقەی باڵی دەداو، هێندەی دڵی ئارەزووی خۆشەویستی‌و دڵسۆزی‌و وەفاداری بکات، لەتەك پێغەمبەری ئازیزدا(د.خ) دەکەوتە هەڤپەیڤین‌و باسکردنی دەروونی‌و چەرخەکەی‌و ئومەتەکەی‌و کۆمەڵگەکەی.

لەڕاستیدا ئەم گفتوگۆیە، هونەری شاعیرانەی لێدەچۆڕاو، ئەو واتاو حەقیقەتانەی کە شاعیر زاڵبوو بەسەریداو جڵەوی گرتبوو هەڵدەقوڵی‌و، چاوەڕوانی هەلی بەرەڵاکردنی بوو، ئەمێستا کاتێتی‌و شوێنی خۆیەتی تائەوەی هەر شتێکی هەیە لە خزمەت ئەو نازدارەدا (د.خ) هەڵیڕژێ‌و کوڵی گریان‌و دووری چەند ساڵەی خۆی بۆ بەیان بکا، سەرباری ئەوەی کە دووری **ئیقبالْ** لە مەدینەوە یەکسان نییە بەدووریی لە پێغەمبەرەوە(د.خ)، لەگەڵ خۆیدا دەکەوتە قسەو دەیفەرموو:

**حمامة جرعی حومة الجندل، اسجعي**

**فانت بمرأی من سعاد ومسمع**[٢٠]

---

[٢٠]– ئەم بەیتە شیعرییە ئاماژە لاواندنەوەی دەنگی کۆترە کەلە زمانی عەرەبیدا پێی دەووترێت (هدیل)، هاوکات ئەو دەنگ‌و ئاوازە خەمبارەیە بەتایبەت لەدەمی بەیانیاندا لەکۆترەوە هەڵدەستێ‌و، خەمی دڵ‌و دەروون بەرباد دەدا، **ئیقبالیش** وەك ئەوەی بەو کۆترەی دەروونی ووتبێ: " **ئەی کۆتری نێو بەردەڵانی حەومەتول جەندەل– ناوی شوێنێکە– بخوێنە، من**

وەك ووتمان ئیقباڵ هەمیشە خۆی بەنزیكی مەدینەو خاوەنەكەی(د.خ)دەزانیّ" چونكە ئەو بەرۆح هەمیشە لەخزمەتیایەتی و تەنانەت بە باسكردنی مەسكەن و ئارامگاهی ئەو ئازیزە (د.خ)چاوانی پڕ دەبێت لەواتای خۆشەویستی و ئەوین، وەك نالی گەورە لەشا بەیتێكا پەسنی رووزەردیی خۆیی و گەورەیی ئەو دوو شوێنە موفەركییەمان بۆ دەكات و دەفەرموێت:

وەی كە ڕوو زەردی مەدینەو روو سیاهی مەككە خۆم

دەركراو و دەربەدەر یارەب دەخیلی عەفووی تـــــۆم

كەعبە ئیشراقی وەكو خورشیدە من چاوم زەعیــــف

لێم بووە مەعلووم كە قوربی بوعدە، بوعدی قوربە بۆم

---

هەردەم وا هەستدەكەم تۆ هێندە لە خەم و ئازارەكانمەوە نزیكی وەك ئەوەی سوعاد بیت". سوعاد ناوی یەكێك لەو كارەكتەرانەی شیعری جاهیلییە كە بەنێوبانگ بووە بەخۆشەویستی و ئەوین، وەك ئەوەی (كەعبی كوڕی زوهەیری كوڕی ئەبو سولما) لەبەیتە شیعرێكیا دەڵێت:

بانت سعاد فقلبي اليوم متبول

متيَم إثرها لم يفد مكبول

وما سعاد غداة البين إذ رحلوا

إلاَ اغنُ غضيضُ الطرف مكحول ( بحر الطويل)

ئەوەتا ( نالی) گەورە، دووری لەمەدینە بەواتای ئەوە نییە کە بە جەستەکەی دوورە لێیەوە؛ بەڵکو ئەو بەواتا ڕوحییەکەی هەتا دوور بێت لیی نزیکە، بەهەمان چەشن **ئیقباڵیش** کە هۆنراوەی بۆ پێغەمبەری ئازیز(د.خ) نوسیبێت لە جوانترینو ڕەوانبێژترین چەشن شیعری بۆ نووسیوە، بەرادەیەك هۆنراوەکانی بوەتە تیریاقی دەروونی، هاوکات تێکرای ئەو ئەزموونەی کەبەسەر خۆیو گەلو نیشتمانەکەیدا هاتووەو هەروەها ئەو هەموو سۆزو عەشقو ئەوینەی کە ئەزموونی کردووە، لەتەك پێغەمبەری ئازیزدا لەدووتویی هۆنراوەدا دەریدەبڕیو وێنای دەکات.

**ئیقباڵ** لەساتی وتنی ئەم بەیتانەدا، وا خەیاڵی دەکرد شەوقو سۆزی بەرەو مەککەو مەدینە بەڕێی کردوەو، لەتەك کاروانیەکەدا بەسەر ئەو لمە نەرمەی وەك ئەوەی سەوزەت تێدا چاندبێت ڕێدەکات، هەر بەو خەیاڵەوە هەستو سۆزی وەها رایدەچنیٚ کەوا هەست دەکات بەسەر نەرمتر لە حەریر پێدادەنیو هاوکات هەر زەڕڕەیەکی -نالی گووتەنی ئەو خاکە پاکە چاکە، ئەو ئەرزە مەتهەرە- دڵێکەو لێدەدات، داوای لە شۆفێرەکە کرد کەلەسەر خۆ ڕێبکات، تۆزقاڵیٚ نەرمو نیان بیٚ بەو دڵە بزواوانە، شۆفیریش هەر لێدەخوریو لەهیچ ناگا، **ئیقباڵیش** خەمەکانی پتر تر دەبزواو جەستەی بەم لاولادا دەلەرایەوەو هەستی شاعیریشی هەردەم دەهاتە کوڵو بەخەیاڵو بەدەم خۆیەوە هۆنراوەیەکی نەرمو بەلیغی دەچڕی.

دوای کەمێك چووە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز(د.خ)و، هەڵی قۆستەوە بۆ ئەوەی زۆرتر باسی خۆی‌و شارو ئومەت‌و ئەو قەیران‌و گیروگرفت‌و، هاوڕێ لەتەك ئەو ماوەیەش بکات کە تێیدا ژیانی گوزەراندووەو دووچاری چەندین کارەسات بوونەتەوە، هاوکات باسی ئەو ڕووداوانە بکات کە چەرخی زەمانەو چەپۆکی ڕۆژگارو ( طارق الحدثان) شارستانییەتی ڕۆژئاواو فەلسەفەی ماددیگەرا بەسەر ئەو ئەمانەت‌و پەیامەیدا هێناویانە، ئیدی ئەبێ ئەو لەکوێی ئەو ڕابردوو تایبەتمەندیانەدا بێت، هەرئەوەندەی بۆ دەکرا دەمێك دەستی دەکرد بە لاواندنەوەو گریان‌و دەمێکیش پلاری لەخۆ دەگرت‌و سکاڵای لەدەستی غەریبی لە نیشتمانەکەی‌و تەنهایی لە کۆمەڵگەکەی‌و لەکیسچوونی پەیامەکەی لە نێو ئومەتەکەیدا دەکرد، کە ئەم کۆمەڵەیەی ناو ناوە (خەڵاتی حیجاز) وەك ئەوەی دیاریەك بێت لەحیجازەوە بۆ هاوڕێ‌و قوتابییەکانی هەڵیگرتبێت، کە بێگومان خەڵاتێکی پیرۆزە بۆ جیهانی ئیسلامی‌و شنەیەکە لە شامالی حیجازەوە.

ئەو دەمەی **ئیقبال** دەستی کرد بەم سەفەرەی حیجازی، ووردە ووردە تەمەنی لەشەست ساڵی نزیك بوو بووەو هێزی لێبڕابوو، لەتەمەنێکدا بوو خەڵکی وچان‌و مانەوەیان لەماڵدا پێ باشتر بوو وەك لەوەی کەسێکی پیرو پەککەوتە کە نەخۆشی‌و مووی سپی گڕی بەردابێتە سەری سەفەر بکات، کە نالی گەورە شاعیر لە بەیتە شیعرێکدا ئەو تەمەنی پیرییەی لەم ژیانەدا کورتکردۆتەوەو فەرموویەتی:

**شەویی بەهاری جوانی خەوێك بوو پڕ تەشوویر**

**لە فەجری پایزی پیری بەیانیدا تەعبیـر**

واتە: " شەویی بەهاری گەنجیی وەك خەوێکی ئاڵۆز بوو، کە هیچ واتاو مانایەکی نەبوو، هەر ئەوەندەت زانی، لەبەرەبەیانی پایزو هەڵوەرینی تەمەنی پیریدا خەوی ئەو شەوە واتاکەی لێکدرایەوە".

بێگومان سەفەر کردن بۆ حیجاز زۆر ئەستەمو نارەحەتەو لەو دەمەدا زۆرێك لە پزیشکانو دۆستانی ڕێنمایی (**ئیقبالْ**)یان کردبوو بۆ ئەوەی وچان بداتو لەماڵدا بحەوێتەوەو نەچێتە دەرەوە، بەلاّم بەگوێی نەکردنو خۆی دایە دەستی فەرمانو داخوازی خۆشەویستی، دەیفەرموو: " **سەربای دەردی پیریی و پەککەوتەیی ڕومکردە شارەکەی سالار (د.خ)، بەو پەڕی خۆشی و سۆزەوە چەندان هۆنراوەو بەیتە شیعرم بەبالاّی مەدینەدا دەچڕی، هیچ جێگەی سەرسوڕمانیش نییە؛ چونکە باڵندە بەدرێژایی ڕۆژ لەو چۆڵو بیابانەدا لەشەقەی باڵ دەدات و دەفڕیو دەست دەکات بەگەڕان، هاوکات هەرکات ڕۆژ پشتی هەڵکردو شەو داهات، دەگەڕێتەوە بۆ هێلانەکەییو تێیدا شەو دەکاتەوە**".

وەك ئەوەی بڵێت بۆچی عەلاّجەویتان لێدێت کە بمەوێت لەدواساتی تەمەنمدا کە خۆری ژین ڕوو لەئاوابوونە، سەفەر بۆ ئەو مەدینەیە بکەم کەوەك هێلانەی رۆح وایە، ئایا نابینن باڵندە هەر کە شەویی بەسەردا هات دەگەڕێتەوە هێلانەو لانەی خۆی.

ئیقباڵ لەو تەمەنە پیرییەدا دەستی کرد بەسەفەرەکەی‌و وشترەکەی بەخێرای لەنێوان مەدینەو مەککەدا دەیهێناو دەیبرد، پێی فەرموو:" لەسەر خۆت خۆشەویستم، چونکە سەرنشینەکەت بنیادەمێکی لاوازو، نەخۆش‌و، بەتەمەنە؛ کەچی وشترەکە سەرگەرم‌و گەشکەی رۆشتن بوو، وەك ئەوەی بەچەشنی ئەو، چەشکەی لەو سەفەرە دڵپەزیرە بردبێت‌و ئەو بیابانەش حەریرو ئاوریشمێك بێت لەژێر پێیەکانیدا، بۆیە هەر گوێی بەسەر نشینەکەی نەدەدا". بەڵێ تەنها ئەوە مرۆڤە دڵپاك‌و عاریفەکان نین، کە شەیدای ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (د.خ)بن و بە شیعر و هۆنراوەکانیان بیلاوێننەوە، بەڵکو دارو بەردو تەنانەت گیاندارانیش شەیدای ئەو نازدارەبوون (د.خ). لەنێوەندی هەموو ئەو عیریفانەشدا هەر یەکە لە (نالی گەورەو مەحوی عاریف‌و مەولاناخالیدی نەقشی‌و بێخودی سالیك‌و مەولەوی سەنگین‌و ناری گەورە شاعیریش) سۆزو تاسەو هەستی بەکوڵیان بۆ مەدینەو خۆڵەکەی دەربڕیوە، وەك نالی گەورە دەفەرموێت:

**تەیبە کە یەعنی تەییب‌و تاهیر بە رەوحی رۆح**

**فەرقی ئەڵێن: گڵی لە گوڵ، ئاوی لە کەوسەرە[21]**

---

[21] - واتە: شاری تەییبە کە ناوەکەشی وادەگەینێ، کە بەهەناسەی پیرۆزی جوبرەئیل، یان لەبەرەکەتی پێغەمبەرەوە ﷺ پاك‌و خاوێنە، ئەڵێن جیاوازیی لە شوێنلنی تر ئەوەیە: خۆڵەکەی لە گوڵ ئەچێ‌و، ئاوی لە ئاوی حەوزی کەسەرە.

**یەعنی گوڵاوی قودسە، گڵاویی ڕەفع ئەکا**

**ئەو خاکە چاکە، پاکەو، ئەو ئاوە مەتهەرە**[٢٢]

**((نالی)) کەوا سەگی سەگی ئەو مەرزو بومەیە**

**ئەمما سەگی موعەللەمی بێ دەنگو بێوەڕە**

بێخودی دێلێژەیی سەنگینیش بەباڵای ئەو پێغەمبەرە ئازیزەدا (د.خ)دوعا بۆ خۆی دەکاتو دەفەرموێت:

**یارەببی بەجاهی جامی ساقیی کەوسەر**

**یارەببی بە توبایی قەدو باڵایی دوڵبەر**[٢٣]

---

[٢٢]- واتە: مادەم گڵی مەدینە گوڵو، ئاوی لە ئاوی کەوسەر بێ، دیارە گڵو ئاوی دەبێ بە گوڵاوی خواییو، گڵاویی گیانی گوناهبارانی پێدەر ئەکرێو، ئەو خاکە چاکو پاکەی مەدینەو ئەو ئاوە کەوسەرییەی ئەبن بە شوێنو هۆی پاککردنەوەی گیانی گوناهباران.

[٢٣]- دولبەر: یەکێکە لە وەسفو پەسنییەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) ڕۆحو گیانمان بەقوربانی بێت. غولامی

((بێخود)) مـــادام لەدۆزەخی گوناهایـــە[24]

دە بی بەخشە بە چاوە جوانەکەی پێغەمبەر

گەر جگێك چاو لەم هۆنراوە قەشەنگەی ((بێخود))ی گەورە بکەین، دەبینین چەندە تاسەو خۆشەویستی‌و ئەوینی بۆ پێغەمبەری ئازیزە (د.خ) پێوە دیارەو، چەندە بە خۆشەویستی‌و هەست‌و سۆزەوە کوڵی سۆزیان بۆ مەعشوقەکەی خۆیان دەربریوە دەپاڕێنەوە خودا بەهۆی پێغەمبەری ئازیزەوە(د.خ) بیان بەخشێ، وەك مەولانا خالیدی نەقشیش بەچەشنی ئەوان دەفەرموێت:

ئیدی بولبول لەبۆنی گوڵ ئەتۆرێ

ئەگەر، با، بۆی بێنێ بۆنی موحەممەد

گەر بیگۆڕییەوە ئەتۆ شێتی خالیـــــد

بەهەردوو دونیا، تاڵە، مویەکی موحەممەد

نەك ئەوەی ئەم شاعیرو هۆزانڤانانەی کورد تەنها بەوەوە وەستابن هەر وەسف‌و پەسنی پێغەمبەری ئازیزیان (د.خ) کردبێت، بەڵکو هاتوون وەسفێکی لەڕادەبەدەری هاوەڵانی ئەو سالارەشیان (د.خ) کردووە، ئەوەتا مەحوی گەورە دەفەرموێت:

---

[24]- بۆ ئەوەی داپەروەربم چەند پیتێ گۆڕانکاریم تێدا کردووە. غولامی

**بە عەکسی نووری پێغەمبەر (د.خ)ئەوەندە مونعەکیس بوو بوون**

**غەریبی تازە هاتوو دەهات و دەیووت ئەم پێغەمبـەرستانە[25]**

بۆیە (( بێخود)) لەوەسفی هاوەڵان و مەدینەکەیدا (د.خ) هاتوەتە سەر پەسنی ئەولادەکانی پێغەمبەری ئازیزو (د.خ)فەرموویەتی:

**گەر هود هودەکەی بادی سەبا بێ لە ((سەبا)) تان**

**گەر تەختی ((سولەیمان)) یبە ئەیخاتە هەواتان**

**سەد شوکری خودا چاکەوە بوو خەستەکەی ئێمەیش**

**ئەی دافیعی تیفۆسی دەروون، تۆزێ دۆعاتان**

**((بێخود)) کەمەتیوی دەری ئەولادی رەسووڵە**

**نازدارە، فەرامۆشی مەکەن، تۆ بی خوداتان**

---

[25] - واتە: هاوەڵان هێندە وێنەی پێغەمبەرﷺ رەنگی دابوەوە لەسەریان، ئەوا؛ هەرکەسێکی نامۆو غەریبە دەهاتە مەدینە، دەیووت: ماشەڵا لەم پێغەمبەرستانە، وایزانیوە هەرچی لەوێدایە تێکرایان پێغەمبەرنﷺ. غوڵامی

شاعیر لەم کاروانە حیجازییەدا درێژە بەسەفەرەکەی دەداو، بەردەوام سەڵاواتی دەنارد بۆ سەر پێغەمبەری ئازیزە (د.خ)و، لەسەر ئەو لمە بەتینە کرنووشێکی سوپاسگوزاریی بەجێدەهێنا کە شوێنەوارەکەی لەسەر تەختی تەوێڵی بۆ هەتا هەتایە شوێنەمای بە جێدەهێشت، هەمان ئەو کرنووشەشی پێشنیار دەکرد بۆ هاوەڵو رەفیقانی، هەستو ئارەزوو تێکڕای جەستەی دادەگرتو، بەدەم ڕێگاوە چەندین بەیتە شیعری لە شیعرەکانی (عێراقیو جامی[٢٦]) دەچڕیو خەڵکیش دەیانپرسی: ئەوە دەبێت چ کەسێکی عەجەمی بێت بە زوبانێك شیعرو هۆنراوە دەچڕێ، کە ئێمە لێی ناگەین؟ بەڵام ئەوە ئاوازێك بوو کە دڵی دەهێنایە جۆشو خرۆشو پڕی دەکرد لە باوەڕو سۆز، بەرادەیەك پیاو لەو بیابانەدا خواردنو ئاویان لەبیر نەمابوو یان دەتوانین بڵێین فەرامۆشیان کردبوو، هاوکات هەر شتێکیش لەو ڕێگایەدا لە شەونخوونیو نارەحەتیو کەم خواردنو خواردنەوە، تووشیاری شاعیر دەبوویەوە چەشکەی لێدەبردو نە ڕێگای بەلاوە درێژ بوو نە سستی دەنواند لە گەشتنی بەمەنزڵ، بەڵکو سەرباری ئەوەش پێشنیاری ڕێگایەکی دیکەی دورتری بۆ هاوەلانی دەکرد تا ئەوەی بەردەوامی بدات بەم شەوقو سۆزەو هەستە جوانەی، تا بێت سوتانی دووریی پەرەی دەسەند چونکە سوتاوی توێشووی عاشقانو گەشتی

---

[٢٦]- دوو شاعیری فارسینو چەندین بەیتە شیعرو قەسیدەیان لە پەسنی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ چڕیوە. دانەر

تامەزرۆیانە، بە هەمان چەشن (( بێخودی)) گەورە لە بەیتێکدا فەرموویەتی:

**بە تیکە تیکە بێ دڵێ کە نەیبێ ئیشتیاقی تۆ**

**حەیاتی من ویساڵی تۆ، فیراقی من، مەماتی تۆ**

بەڵێ؛ بەم چەشنە موحەممەد **ئیقباڵ** درێژە بەگەشتە پڕ سۆزو ئەوینەکەی دەدات، تا دەگات بە شاری مەدینەی مونەوەرە، کە نالی لەوەسفی پێغەمبەری ئازیزدا (د.خ)بەرامبەر مەدینەکەی خۆی بە مەدیوون دەزانێ و سلاوی لێدەکات و دەفەرموێت:

**ئەسسەلام ئەی ساکینی ریازی مەدینەی منەوەرە**

**لوتفێ بکەو، بفەرموو بڵێ:" مەدینەی منەو وەرە"**

**ئیقباڵ** لەدەمی گەشتنی بەو شارە پیرۆزە، ساتێک بەهاوەڵەکەی دەفەرموێت:" **وەرە هاورێم، ساتێک دەست بەگریان بکەین و پێکەوە قسە ئاڵوگۆڕکەینەوەو هەناسەمان بەر با دەین؛ چونکە ئیدی ئێمەش لەتەک ئەم مەحبوبەماندا کارێکی دیکەمان هەیەو لەخودا بەزیاد بێت دوابەدوای درێژی ماوەی فیراق و تامەزرۆی و ئیشتیاق، قەدەر یاوەرمان بوو، گەشتنمان بە مەنزڵ کارێکی دڵخۆشکەر بوو بۆمان**".

ساتێکیش لێل خۆیا دەکەوێتە گفتوگۆو سەری سوڕدەمێنێ کە بەتەنها ئەو لەنێوەندی تێکڕای ئەو خەڵکەدا بەم خۆشبەختییە نەبراوەیە شادبووەو دەڵێت:" **هیچ جێگەی سەرسوڕمان و عەلاجەری**

نییە؛ چونکە خۆشەویستان‌و ئەویندارانن لێرە، گەلێك لە دادوەران‌و کاربەدەستانی مایە پووچی دونیا ڕێزیان زیاترە، ئەی خۆشبەختی مەزن‌و چارەو بەختی جوانخاس!! هەموو شتێك کۆتایی هات؛ چونکە ئیدی ڕێگەدرا بە بێکەس‌و هەژارێکی کۆیلەی وەك من، بێتە خزمەتی پادشای جوانی‌و سوڵتانی ئەوین‌و سۆز".

**ئیقباڵ** – خۆشبەختی‌و سۆزو هەستەکەی لەخزمەت پێغەمبەری ئازیزدا (د.خ)– هێندەی نەبردو بەچەشنێکی ڕەوانبێژی شاعیرانەو ڕاستگۆیەتی سەرکردانە، هاتە سەر باس‌و خواسی، گەلە هیندییە موسوڵمانەکەی‌و دەستی خستە سەر برینە بەسوێکانی‌و ئومێدە نەهاتووەدییەکانی ئومەتەکەی‌و فەرمووی: " ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) و، لەڕاستیدا ئەم موسوڵمانە بێهومێدە، کە ئەمێستاش لووتبەرزیی‌و خوودگیریی لەبارگەدا هەر ماوە، ئیدی وردە وردە لەتەك چەرخی ڕۆژگاردا سۆزی دڵ‌و ئیکسیری خۆشەویستی لەدەستداوە، بارەرکە ئەو دڵەی کەهەر دەم بەخۆشەویستی‌و نازەوە بەند ببوو، ئێستا خەمبارو خەفەتبارو شکاوە، بەڵام هەرچەن دەکات نهێنی ئەو خەفەتبارییەشی نازانێت‌و پەی پێنابات، ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ)! دەبێ بەهۆی ئەو هەموو سۆزو خۆشەویستییەوە چیت بەسەر ئەو دڵە شێواوەمدا هێنابێت، من دەبایە چیم کردبا؟. ئەم وێنەیەی (ئیقباڵ) گەلێك لەو هۆنراوەی ((مەحوی)) دەچێت کە دەفەرموێت:

لەکوێ یاڕەب خەبەر پرسی بکەم من کە

## هەرکەس بۆ خەبەر چوو بێ خەبەر کەووت

ئایا تەنها دڵم ئەوەی بەس نییە لەو لوتکە بەرزەوە کەبەهۆی ئەو موحەبەتەوە پێی گەشتبوو، فڕەدرایە خوارەوە؟ سوێند بەخودا هەرکات بەو شوێنەی کە لێیەوە ئەم دڵە خەمبارەمی لێفڕەدراوەتە خوارەوە بەرز دەبێتەوە، تابێت ئازارەکانی زیاتر تەشەنە دەسێنێت‌و ئۆقرەی یەکجارەکی لەبەر دەبرێت. پێکدادانەکە گەلێك گەورە بوو، بەڵام خودای مەزن لوتفی بەرامبەر ئەم ئومەتە بێهیمەتە نواندو لە بەرزی‌و گەورەیی‌و مەجدەوە فڕێی دان تاوەکو قەدری خۆیان بزانن‌و بەخۆیان کەونەوە. (ئیقبال) درێژە بەقسەکانی دەدات‌و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ)! ئەو ئەمێستاش زەمەن لەگەڵیدا دوژمنایەتیەتی‌و ئێستاشی لەگەڵ بێت کاروانەکەی لە بیاباندا وونەو دوورە لەمەنزڵ‌و نیازەوە، تەنها شتێك کە بەس بێت دەربارەی ئەم ئومەتە بیزانی ئەوەیە کە ئەمێستاش لە نەهامەتی‌و ئاژاوەو خوت خوتەو بێ پێشەواییدا ژین دەگوزەرێنێ. لەراستیدا کێلانی شمشێرەکەی بەچەشنی کیسەکەی خاڵی‌و چۆڵە، ئەو کەنارگیرێکی نەدارو هەژارە، ئەو پەرتووکەش کە قورئانەو توانی هەموو جیهان فەتح بکات، ئێستا لەماڵە کاول‌و داڕماوەکەیدا وەك بێوەفایەك لەنێو دەلاقەیەکدا کە خۆڵی دونیا بەسەریدا کەوتووەو جاڵجاڵۆکەش دەزویی لەسەر تەنیوە جێی هێشتووە، دواتر دێتە سەر باسی خۆی‌و دەڵێت: ئەو کەسێکە کەبە درێژایی ژیانی سەوداسەری لەتەك سەرکەشی‌و پاڵەوانانددا هەبووەو، لە زوبانی سەرکەشان‌و ترس‌و بیمی ئازایان‌و موجاهیدان ئاگاو،

**بەرادەیەك هۆگری ئاوازی گۆرانبێژان بووەو لەنێوەندی هەناسە بڕکێ‌و نرکەو ناڵەیاندا ژیاوە، بۆیە چاوانی نوورو روناکی لێبڕاوەو دڵیشی لە خۆشی‌و فەرحانی بێبەش بوو، بەدبەختییەکەشی ئەوەیە: دەژی بەلاَم لەززەتی وەسڵ‌و ئامادەگی‌و حوزوور نازانێ"[٢].**

دواتر دێتە سەر باسی ئەو رابوردوە گەورەیەیی کە رۆژانێك جێگەی پارێزگاری‌و بایەخپێدان‌و بەدەمەوەچوون بووەو ئەمێستاش رۆژانێکی دڵرەق‌و مۆن‌و گرژی تێدا بەسەر دەبات‌و چەندەش نارەحەت‌و ئەستەمە کەناربگرێ‌و تەنها پشت بەخۆی ببەستێ‌و زەحمەتبکێشێ، ئەو ووتەیەی زۆر جوانە کە دەفەرموێت: "**ئەو وەك ئەو باڵندە جوانەیە، کە بەدەستی خۆت خواردنت پێدابێ‌و بەمیوە بەخێوت کردبێ، بەرادەیەك وای لێهاتبێت ئەستەم بێ‌و نەتوانێ خۆی بە شوێن قووت‌و خواردن پەیداکردندا بگەڕێ"[٢].**

موحەممەد **ئیقباڵ** -کە یەکێکە لە گەورە زانایانی بواری فەلسەفەو رامیاری و ئابووری- دێتە سەرباسی ئەو ئاژاوە بێدینیەی کە ڕووی کردۆتە جیهانی ئیسلامی‌و، بەو شێوەش پێناسەی دەکات کە هۆیەکەی تێڕوانینێکی ماددی‌و نەمانی ڕۆح و خەم ساردییە، هاوکات بوونی ئەو ژیانە ئاسوودەو لوتبەرزەیە کە خەڵکی ئەم سەردەمە دەیگوزەرێنن، پێیشی وایە کە هیچ ڕێگاو میکانیزمێك لە ئارادا نییە بۆ تێپەڕاندن‌و بەرەنگاربوونەوەی ئەم بێدینی‌و فەلسەفە ئابووریە ماددییە تەنها لەڕێگەی ئەو ژیانەوە نەبێت کە لەسەر سێپای خۆشەویستی‌و خواناسی وەستاوە، هەروەها ئەو ژیانەش کە پێشەوا ئەبوبەکری

صدیق و خۆشەویست‌و خواناسی تێدا ژیاوە، بەڕادەیەك ئاواتی وەها ژیانێکی نمونەیی کە خۆشەویستی‌و خواناسی باڵیکێشابێ بەسەر خەڵکیدا، بۆ هەموو موسوڵمانێك دەخواست" چونکە گەر وەها ژیانێك بوونی هەبێت، خەڵکی ناچار دەبێت ڕێزی بگرێ‌و قەدری بزانێت، لەبەر ئەوەی ئەو مرۆڤەی ئاواتی وەها ژیانێك بۆ موسوڵمانانی برای خۆی بخوازێ، گومانی تێدا نییە کە ژیانی ئەم دونیایەی بەلاوە گرنگ نییەو هەردەم چاوی لە دیوی ئەو دیوی ئەو شتانەیە کەلەم جیهانە بە چاوی دڵ نەبێ بەهیچ شتێکی تر نابینرێ و چاوناکرێ، وەك ((**بێخودی**)) گەورە لەشا بەیتێکا فەرموویەتی:

برا، خۆ تۆ لەلای خۆت مەخزەنی عەقڵ‌و کەمالاتی!

کەچی تا دەوڵەمەنتر بی فەقیرو سواڵکەرو لاتی

ئەگەر (مازی)ت لە دەس چوو هێندە بێحاڵیشی ئەی غافڵ

لە (ئیستیقبال)ی خۆت ئاگات نییە؛ چوون بێ موبالاتی

بەقەسری ڕووی زەمین تێر نابێ، قەت چاووت وەکو فیرعەون

خوا دەستت نەدا، دەستت ببێ ڕوو بۆ سەماواتی

بەجاهی خۆت مەنازە، پۆستەمی قابیز لەڕێتایە

ئەگەر سەد شاهی (چین)یش بی، کشێکت هاتە بەر ماتی

واتە: وەك(( شا)) لەیاری شەترەنجا (کش)ی لێدەکریٚو ئەفەوتیٚ، بنیادەمیش کە عیزرائیل (کش)ی لێکرد کش‌و مات دەبیٚ[٢٧].

**ئیقباڵ** لادانی موسوڵمانان بەهۆی نەداری‌و لاوازیان لەماددەدا ناکات بە بیانوو، بەڵکو کوژانەوەی ئەو بڵێسەیەی کە زەمانێك لە سنگیانا گڕی گرتبوو دەکاتە بەبیانو و دەڵێت: " **لەڕاستیدا کاتێك ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە سەرەتاییە هەژارانە زانیان چۆن چۆنیو بە تێکڕا لەبەردەم خودای خۆیاندا لەیەك ڕیزدا بوەستن، توانیان یەخەی پادشایان و مەلیکەکان بگرن بەدەستیانەوە، بەڵام کاتێك ئەو پشکۆیە لە سنگیاندا ڕووی لەکوژانەوە کرد خۆیان پێچایەوەو هەریەکەیان کون‌و قوشبنی گۆشەو تەکییەکانی کردە پەناگەی خۆی**".

**ئیقباڵ** کۆی مێژووی موسوڵمانانی خستە ڕوو، کەچی شتانێکی لەو مێژووەدا بەدی کرد کە هەموو موسوڵمانێکی شەرمەزار دەکرد، بەڕادەیەك هیچ یەك لەو مێژووەدا لەتەك پەیامی موحەممەدی‌و ڕێنمایی‌و وێنە باڵاکانی ئیسلامدا یەکی نەدەگرتەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە غەنی بوو لە هاوبەشدانان بۆ خوداو پەرستشی غەیری خوداو ملکەچی‌و سەرنەویکردن بۆ ستەمکاران‌و لەڕێدەرچووان،

---

[٢٧]- بۆ ئاگاداری خوێنەری بەڕێز، کۆی ئەو هۆنراوانەی ((**بێخود**)) کە ئاماژەی پێکرا، لە دیوانی (**بێخود**)ەوە وەرگیراوە کە لەکۆکردنەوەو ڕێکخستن‌و لەسەرنووسینی مامۆستا موحەممەدی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیسە. *غوڵامی*

بەئەندازەیەك عەرەقی شەرمەزاری لە نێوچەوان تك تك دەهێنایە خوارەوە.

**ئیقباڵ لەساتی** باسکردن و خوێندنەوەی ئەم مێژووەدا سەری شەرمەندەی دادەنەواندو بەو پەری دانپێنان و ڕاشکاوانەو ڕەوانبێژییەکی کورتبڕەوە، دەیووت: "**کورتەی قسەکە ئەوەیە کە بڵێین: ئەی پێغەمبەری خودا** (د.خ) **ئێمەمانان بەهیچ کلۆجێك شیاوی تۆ نین**". دواتر تەماشایەکی جیهانی ئیسلامی دەکردو گەشتێکی بەنێو بنکەو بارەگاکانی جیهان ئەنجام دەداو، سکاڵای لەدەستی لاوازی و نەداری و هەژاری مەعنەویی خۆی دەکردو دەیووت: "**ئەم بنکەو بارەگا رۆحیانە، ئەمێستا وایان لێهاتووە کە نە خواردنی دڵانیان لەلایەو نە هەڵگری پەیامی خۆشەویستیشن، هاوکات بنکەو قوتابخانە زانستییەکان ( کۆی قوتابخانەکان بە واتا فراوانەکەی) لاسایی کردنەوە زاڵبووە بەسەریانداو، چەشنی گای ئاش لەیەك خولگەدا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو وەك تووتی هەر ئەوانە دەڵێنەوە کە لەرابوردودا وتویانە، ئیدی هیچ داهێنانێکی تێدا بەدی ناکەیت، هەرچی یانەکانی شیعرو ئەدەبیشە بە خەفەتباری و خەمۆکییەوە لێی دەربازبووم؛ چونکە لە ئاوازو فیکرەکانیدا شتێکی تێدا نەبوو کە دڵت بهەژێنێ و هەستت ببزوێنێ، ئەوەندە نەبێ بەچەشنی هۆنراوەیەکی ساردو سڕ کە لەدڵێکی ماسیاوەوە دەربچێ، ئەدەبێکی مردوو بوو کە لە ئەدیبێکی مردووەوە سەرچاوەی گرتبوو**".

درێژەی دەدا بە قسەکانی‌و دەیووت:" **تێکڕای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوام تەیی کرد، چەندین شارو وواڵتم بینی کە پڕبوون لەو موسوڵمانانەی زەندۆقیان لەمەرگ چوو بوو، کەچی تەنها موسوڵمانێك کە مەرگ لەو ترسا بێت (یفرق الموت منه)، نەچاووم پێی کەووت‌و نە شوێنەواریشم بەدی کرد**".

دواتر دێتە سەر باسی ئەو نهێنییەی کە لە لاوازی موسوڵمان‌و کوژانەوەو پەرتەوازیاندا بەدی دەکرێت‌و دەڵێت:" **ڕۆژێکیان بارودۆخی موسوڵمانان هێندە ناڕەحەت‌و بێتاقەتی کردم، تا ئەوەی سکاڵام بردە بەردەم بارەگاهی خودا، پێم ووترا: ئایا نازانی ئەمانە هەڵگری دڵانێکن کە مەحبووب ناناسی؟! واتە ئەوان ماددەی خۆشەویستیان پێیە، بەڵام نازانن ئاراستەی کێی بکەن‌و سەرقاڵی کەن بەکێوە، دڵەکانیان سەرگەردانەو عەقڵیشیان هەژیو بەلەسەیەو هەوڵیشیان بێماناو کرداریشیان لاوازو ژیانیشیان نە چێژیی تێدایەو نە خۆشی**". ئەوە ژیانی کەسێکە کە هەڵگری دڵەو لە خۆشەویستی بێبەشە، یان ژیانی کەسێکە کەخۆشەویستی دەزانێ بەڵام نازانێ مەحبووبەکەی کێیە، بەبێ گومان ئەوەش ژینێکی پڕ ئازارو ناڕەحەتی‌و سەرگەردانی‌و گومڕاییە نەزیاتر.

بەڵام سەرباری کۆی ئەوانە نە بێهومێد لە موسوڵمانان‌و نە بێ هیواشە لە لەڕەحمەتی خودا، بەڵکو ڕەخنەو گلەو گاز لەو پیاوە ئایینیانەش دەکات کە بێهیوا بوون لەموسوڵمانان‌و دوابڕاو بوون لە سەرلەنوێ هەستانەوەیان‌و، بەستنەوەی ئومێدیان بە غەیری ئەوانەوە،

**بۆیە بە پلارو ئاهی پر ئازارەوە دەڵێت: "بەڕاستی تێکرای بارودۆخ‌و گوفتارو گوتارەکانیان ئەوە دەگەیەنێ کە بەتەواوی بێهومێدو ڕەشبین بوون لە تێکرای ئەسبابەکانی خێر، بەڕادەیەك بەچاویلکەو تێڕوانینێکی ڕەشەوە دەڕواننە موسوڵمانان، کە بێگومان کەسی ئیماندارو موسوڵمان سەرباری ئەوەی لەجوامێری‌و بەخششی موڵك‌و سەڵتەنەتدا تەنیا بێت‌و خاوەنی هیچیان نەبێت، بەڵام خۆ هیچ نەبێ ویژدان‌و بیرکردنەوەیان وەك سوڵتان‌و موڵکدارەکانی دونیایە، وە گەر ڕۆژێك لەڕۆژان بۆی بگونجێ بگەڕێتەوە بۆ مەڵبەندی ئاسایی خۆی، ئەو ساتە جوانییەکانی دەبێت بە شکۆمەندی‌و دەبێتە خاوەنی دەسەڵاتێك کە چاوەڕوان نەکراوە".**

لێرەدا موحەممەد **ئیقباڵ** ڕوودەکاتە خۆی‌و سەرگوزەشتەی خۆی دەگێڕێتەوەو سکاڵا لەدەستی ئەو تەنگ‌و چەڵەمانە دەکات کە دووچاری کۆمەڵگەو ئەهلی چەرخەکەی بوونەتەوەو دەڵێت:" **بەڕاستی من شایەنی سۆزو بەزەییم؛ چونکە هەمیشە لەململانێیەکی توندو جەنگێکی بەردەوامدام لەتەك ئەم چەرخە ماددیەدا".**

بەردەوام **ئیقباڵ** ژیانی لە ململانێدا بووە لەگەڵ ئەم چەرخەی ئێستاداو هەمیشە لە دژایەتیدا بووە لەهەمبەر شارستانی ڕۆژئاواو فەلسەفەی ماددیداو لەڕوویاندا وەك کێو وەستاوەو ڕەخنەی لێگرتوون، بەچەشنێکی دلێرو جوامێرانە کۆی بۆچوون‌و قسەکانیانی بەدرۆخستۆتەوە، **ئیقباڵ** پەروەردەکاری نەوەی نوێ‌و، باوەڕدارێکی بێوێنەی متمانە بەخۆو، پشت ئەستوور بەکەسێتی خۆی‌و ئیسلامەو،

بێباوەڕ بووە بەو بنەماو بیرە مادديگەرانەی کە شارستانییەتی ڕۆژئاوای لەسەر ڕاگیراوە، بۆیە حەقییەتی بڵێت:" **بانگەوازی ئەو ئیحرامەم ڕاگەیاند، کە دوێنێ (مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی) رایگەیاند، من نهێنییەکانی رۆح و خۆشەویستی و ئەوینی لێ فێربووم؛ بەڕاستی مەولانا شۆڕشی بەسەر ئاژاوەو فیتنەی سەردەمی خۆی بەرپاکردو منیش شۆڕشم بەرامبەر ئاژاوەی ئەم چەرخەدا بەرپاکرد**".

دواتر دێتە سەرباسی ئەو یاخیبوون و دەربازبوونەی کە بەسەر زانستەکانی ڕۆژئاوادا کردوویەتی، هاوکات بیرو باوەڕو عەقیدەو تایبەتمەندییەکانی خۆی پاراستووەو، بەوپەڕی شیاوی و حەقی خۆیەوە دەڵێت:" **من چەشنی ئەو باڵندەیەم کەبەسەر تۆڕێکدا دەکەوێ و، بەدەنووکی پەتی تۆڕەکە دەبڕێ و، دانەوێڵەو دەنکە گەنمی خۆی دەبات و دەفڕێ**"، هەرواش بوو؛ چونکە ئەو سەرکەوتوو بوو لەچوونە نێو کرۆک و فێربوونی کۆی زانستەکانی ڕۆژئاواو دواتر فڕێدانی توێکڵەکەی، هەروەها بەساغ و سەلامەتی دەربازی بوو لەو تۆڕو پەتە. لەپاشان بەشانازی و شکۆمەندییەوە ڕوودەکاتە خوداو دەڵێت:" **خودا خۆی دەزانێت! کە من بەبێ ئەوەی خەوشێ بکەوێتە عەقیدەو بیرو باوەڕو ڕەوشت و ئاکارو هاوڕێ لەتەک پچڕانی پەیوەندییم لەگەڵ خۆیدا، خۆم خزاندۆتە نێو قوڵایی ئەم زانستانەوەو بەئاگریان داخکراووم و بەوپەڕی ئازایەتییەوە لەنێو کڵپەی ئاگرەکەیدا نیشتەجێبووم و، بەچەشنی ڕزگاربوونی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) لەئاگری بەتینی نەمروود، بەسەلامەتی لێی دەربازبووم**"

شاعیر لێرەدا باس لەو ژیانو ڕۆژگارانە دەکات، کە لە وولاتانی ئەورووپا لەنێوەندی پەرتووکە وشکو، فەلسەفە ووردو درشتو، زانستە فراوانو، جوانییە دڵڕفێنو، دیمەنە دڵپەزیرەکەیدا بەسەری بردووەو دەڵێت:" **لەڕاستیدا سەرمسووڕدەما لەو ماوەیەی لەوێ بەسەرمبرد، بێئاگابووم لەکەسایەتی خۆم، بەڕادەیەك هەرساتێ چاوم بەخۆمدا دەخشاند، خۆمم نەدەناسییەوە، لەراستیدا زۆرێکم لە زانستی ڕۆژئاوا گوڵچن کردو لە شەرابی مەیخانەیان پەرداخم لێوان لێو (دهاق) کرد، ئای لەو سەرئێشەیەی کەبەدەستی خۆم کڕیم! من زۆر لە نێوەندی زانایانیو فەیلەسوفەکانیو کەشە قەشەنگو نەرمو نیانەکانیان ژیانم گوزەران، ئای لەو ماوە تاریکەی ژیانم کە لەوێدا بەسەرم بردا کە بێبەش بووم لەهەموو مانای خۆشەویستیو خۆشحاڵی دڵ، هاوکات وانەی حاکمەکانی سەری دەیەشاندمو دڵو دەروونو ئاوەزی لێڵ دەکردم، چونکە من لە کۆشی خۆشەویستیو باوەڕدا گەورە بوومو هیچ شتێکیش بۆشایی دڵمی پڕنەدەکردەوە سۆزو ئەوینو نەوازش نەبێت**".

لێرەدا شاعیر ڕوودەکاتە ئەو چینەی کە لەجێگەی زانستو ئایین خۆیان دەنوێنن، ڕەخنە لە وشکیو فراوانیو گەورەبوونی زانستەکەیان لەسەر حسابی نەوازشو خۆشەویستیو شەیدایيو بەسوێی دڵ دەگرێو دەڵێت:" **لەراستیدا زانای ئایینی هەڵگری هیچ خەمێك نییە، چاوانی بینایە، بەڵام وشكو برنگەو فرمێسکی لێنایە، تا توانیم خۆمم لەهاوڕێیەتی دوور خستەوە؛ چونکە دلرای زانستێکی بێ خەمەو زەوییەکی پیرۆزی بێ زەمزەمە**". موحەممەد ئیقبال نمونەی ئەو

زانایەی بەزەوی حیجاز چواندووە، کە هەڵگری زانستێکی زۆرو عەقڵێکی گەورەیە، بەڵام زۆر بەداخەوە دارای لمێکی وشكو چیایەکی بەردینە، تەنانەت نەك زەمزەم بەڵکو تنۆکێك ئاویشی تێدا بەدی ناکرێت[28]، گەلێك نەدارو هەژارە ئەو زانا ئایینییە کە خاوەنی زانستێکی زۆرو، زوبانێکی ڕەوان و، عەقڵێکی ڕووناك بێت، وەلێ نە هەڵگری تکێك فرمێسکەو نە شەیدایی‌و بەسوێی لەدڵو دەروونیدا بەدی دەکرێت، تەنانەت لەو زەوییە چاكو پاكو پیرۆزەدا هەر زبری‌و ڕەقییەکەی وەرگرتووەو تەڕی‌و شێداریی‌و نەرمیی‌و ئاوونگو شەونمی فەرامۆشکردووە.

پاشان دێتە سەر باسی خۆی‌و دەڵێت:" من هەرگیز ویژدانو دەروونم بەکەس نافرۆشم، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیشم داوای یارمەت لەهیچ کەس ناکەم، لەبەر ئەوەی لەژیانمدا بۆ تەنها جارێك پشتم بەغەیری خودا بەست، خودا پێی نواندمو دوو سەد جار سزای ئەو ناکەسکارییەی داووم". دواتر پاڵ بەخۆیەوە دەنێو بەخەمو ئازارەوە سکاڵا لەدەست کۆمەڵگەو چەرخەکەی دەکات‌و، دەڵێت: "من بە ئاگری سۆزو خۆشەویستیم سووتاووم، سەرمسوڕدەمێنێ کە لە زەمەنێکدا ژین دەگوزەرێنم کە خاڵییە لە دڵسۆزی، جگە لە ماددەو پێویستییەکانی هیچی دیکە ناناسێت، لە زەمەنێکدا کە خاڵییە لە شەیدایی دڵو چەشتنی چێژی خۆشەویستی، من لە ڕۆژهەڵاتو

---

[28] - کە باسی مەککە دەکەم مەبەستم ئەوەیە کە مەککە بەخانوو و زەمزەمەکەیەوە نەك تەنها بەلمو چیاو دۆڵیەوە. غولامی

ڕۆژئاوا خۆم بە نامۆ دەزانم، بەتەنها دەژیم‌و، بەتەنهاش بۆ خۆم گۆرانی دەچڕم‌و، هەردەم لەتەك خۆمدا دەدوێم‌و ئازارو خەمەکانی دەروونم کەمدەکەمەوە". هاوکات دەڵێت:" لەڕاستیدا براکانم ئەوەیان نەکرد کەمن پێم گووتبوون، ئەوان خورمایان لە دارخومای هۆنراوەکانم نەچنییەوە، ئیدی ئەی گەورەو سەرداری ئومەت (د.خ) سکالاّم هەر بۆ لای تۆ دەبەم، سکالاّ لەدەستی کەسانێك کە وەك شاعیرو غەزەلنووسێك لەمن ناڕوانن. دەتوانم ئەو هەست‌و سۆزەی ئیقباڵ بەهۆنراوەیەکی (بێخود)ی گەورە دەربڕم کە فەرموویەتی:

بەدەشتی پڕ جنوونی ئاخەوە مەجنوونی شەیدا خۆم

بەشاخی (بێستوون)ی داخەوە فەرهادی ڕیسوا خۆم

لە(کەنعان)ی فیراق‌و جان گودازیدا وەکوو (یەعقووب)

لە(میسر)ی ئیشتیاق‌و عیشقبازیدا (زولەیخا) خۆم

**بەدەم دەننوکی چەرخی چنگ بەخوێنی دەردەوە (( بێخود))**

**لە چۆڵی گەرمیانی بێ نەواییدا حوبارا[٢٩] خۆم**

**ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەی ئازیزەکەی دڵم (د.خ) ئەی هۆگری چاوانم (د.خ) ئەی سۆمای دیدەکانم(د.خ)ئەی هێوورکەرەوەی رۆح و گیانم (د.خ) خۆت چەندین جار فەرمانت پێکردووم کە پەیامی ژیان و نەمریان پێبگەیەنم، فووی چالاکی و ڕاپەرینیان بەرۆحا بکەمەوە، بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو دڵرەقانە دەیانەوێت من لەهۆنراوەو قەسیدەکانمدا سازو ئاواز بەسەر مردواندا بخوێنم و، شیعر بۆ مێژووی وەفاتیان دابنێم، ئەدی ئەمە لە کوێی ئەوەدایە کەجەنابت فەرمانت پێکردووم؟!".**

لە نێوەندی ئازارو خەمێکی قوڵدا سکاڵا لە خوداناسی و زوهدی ئەوەی چەرخەکەی هەم لەو زانستەدا دەکات کە هەڵی گرتووەو هەم لەو پەیامەش کەلە هۆنراوەکانیدا باسی لێوە کردووەو دەڵێت:" **دڵم ڕاخست بەو هیوایەی کەسێك کۆت و دیل بکات، بەڵام هیچ کەس نەهات بەدەممەوە، هەرچی سەروەت و سامان و ئەوەشی لەسنگمدا شکم نەبرد بەخشیم، بەڵام کەس قەدری نەزانی، کەوابوو توبی خودات با خۆشەویستیت دڵم ئاوادان بکاتەوەو باس و خواسی تۆش ببێتە قسەو گووتەی سەرزارم؛ چونکە لەم جیهانەدا هیچ کەس شك نابەم لەمن تەنیاترو نامۆترو غەریبتر".** بۆیە دواقسەکانی بە چەند بەیتێك

---

[٢٩]- حوبارا: تەیرێکە پێی دەڵێن کەرەواڵە، واتە گەر بەیانیان لە هێلانەکەی دەرچوو لەئێوارەدا ناتوانێت بگەڕێتەوە.

ئاڕاستەی سەرۆکی ئەوکاتەی سعودییە ( **عەبدولعەزیزی کوڕی سوعود**) دەکات – بەو پێیەی پادشای حیجازبووە لەسەردەمی خۆیدا– ئەو گوتارەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاڕاستەی تێکرای پادشایان‌و مەلیکەکانی عەرەب‌و گەورەکانیان کردووەو، لە یارمەتی وەرگرتن لە وڵاتانی بێگانەو دەوڵەتە ئەورووپییەکان ئاگاداریان دەکاتەوەو هاوکات داوایان لێدەکات کە تەنها پشت بەخوداو بەخۆیان ببەستن‌و دەڵێت:" **لەهەرکوێیەکی بیاباندا دەتەوێ خەیمەکەت هەڵبدە، با دەوڵەو خەیمەو کەپرەکەت لەسەر پێی خۆی بوەستێ، لەیادت نەچێ کە داوای یارمەتی لەبێگانە حەرام‌و نەخوازراوە**".

کۆتایی ئەم بەشەی زانای گەورەو فەیلەسووفی ئیسلام دکتۆر موحەممەد **ئیقبال** بەو هۆنراوەی (بێخود)شاعیر دێنم کە دەفەرموێت:

**تو خودا با هێننە بگریم تا بزانن (( شارەزوور))**

**سەیلی فرمێسکی من، ئاوی ((زەڵم))ی لیخن کردووە**

**گەر ئەپرسن چۆنە (بێخود)؟ دڕک‌و داڵی دەشتی عیشق**

**دوور لە ئێوە پێی دڵیشی دەرزی ئاژن کردووە**



## نوێنەرانی ئوممەت لە نێوان دەستی پێغەمبەردا ﷺ[20]

خودا لە مێژوو نووسان و مێژووپەروەران خۆشبێت، کە بەردەوام هەست و بیری مێژووییان لە پیرۆزترین شوێن و باشترین کاتدا لێجیانابێتەوە، ئەو وانانەش کەلە ڕووداوەکانی مێژوودا ڕوودەدات هەردەم خوێندنەوەیان بۆی هەیەو لەگەڵیاندا دەژین و ئێستایان بە رابوردووەوە دەبەستنەوە.

---

[20] - لە وێستگەی رادیۆی سعودییە لە جیددە، سالی ١٩٦٢ ز بلاوکردەوە. دانەر

دوێنێ لە ڕەوزەی پیرۆزی پێغەمەبەری ئازیز (د.خ) بووم، کۆمەڵێکی زۆر لەنوێژخوێنان و پەرستشکاران لەدەوروپشتم کۆبوونەوە، هەندێك لە کڕنووشداو هەندێکی تریش لە چەمانەوەدا بوون، لێرەو لەوێش بەچەشنی دەنگ و نووزەی مێشهەنگ خوێندنی قورئان دەهاتە بەرگوێم، تێکرای ئەمانە شیاوی ئەوە بوون کە بیرو خەیاڵم سەرقاڵی مێژوو و پیاوانی مێژوو بکات، بەڵام هەوری بیرەوەرییە کۆنەکانی مێژوو باڵی کێشا بەسەرمداو نە دەمتوانی پاڵیان پێوە بنێم نە تواناشم بەسەریاندا دەشکا. وام هەست دەکرد کە گەورەکانی ئەم ئومەتە سەرلەنوێ دەژێنەوەو، تێکرایان بەچەشنی نوێنەر پۆل پۆل دێن و سەڵات و سەلام لەسەر ئەو پێغەمەبەرە ئازیزە (د.خ) دەدەن و بەئەرکی ڕێزو شکۆمەندی و دانپێنان و منەتکردنی قەشەنگی خۆیان هەڵدەستن و، وێرای جیاوازی چینایەتیان شایەتی بەشانی ئەو پێغەمەبەرە مەزنەدا (د.خ) دەهێنن، کەبە ئیزنی خودا لە تاریکییەوە بۆ نوورو، لە بەدبەختییەوە بۆ خۆشبەختی و، لەپەرستنی بتەوە بۆ پەرستشی خودای تاك و تەنها و لەستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام و، لەتەنگەبەری دونیاوە بۆ بەرفراوانی ئاخیرەت، دەربازیکردن و بۆ هەتاهەتایە ڕزگاری کردن، خۆیان شایەتی بەشانی خۆیاندا دەهێنن کە ئەوان نەمامی ئیسلام و چاندووی دەستی پێغەمبەرایەتین و، — خوانەخواستە– گەر خۆیان لەو ڕێزو تەقدیرەی کەخودا لەڕێگەی ئەم پێغەمەبەری ئازیزەوە (د.خ) پێی بەخشیوون، دوورە پەرێز بگرن و خۆیانی لێکێل بکەن، ئەوا دەبنە جەستەیەکی بێ گیان و، هێڵێکی ئاڵۆز، هاوکات دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی تاریکی و یاسای دارستان و

ڕێسای چەتەکان؛ بۆیە لەدوا ساتدا مەشخەڵی ئەم شارستانییەتە دەکوژێتەوەو جارێکی دی ڕۆشنایی بەخۆیەوە نابینێت.

لەساتی لاکردنەوەمدا پۆلێك خەڵکم بەدی کرد؛ کە ئارامیو ویقاریان پێوە دیار بوو، لەهەمان کاتدا ڕووناکی زانستو سیمای بیرکردنەوە بەسەر سەریانەوە نما بوو، لەدەرگای ((جیبیرل))ەوە دەهاتنە ژوورێ – ئەوە نزیکترین دەرگا بوو لێمەوە– کە نێوانی دەرگای (جیبیرل)ی لە چەپەوەو دەرگای (ڕەحمەت) یش لە ڕاستەوە تەنی بوو، هێندە زۆر بوون نەدەتوانرا هەژمارکرێن، دەربارەیان لە دەرگاوانەکەم پرسی، وتی: "ئەوانە زانایانی ئومەتو پێشەوایانی زانستو پیتۆڵی مرۆڤایەتیو کەڵەزانای وجوودن، هەریەك لەوانە پێشەوای گەلێكو دامەزرێنەری پەرتووکخانەیەكو داهێنەری زانستێكو پەروەردکاری (مربی) جیلێکن، کە شوێنەواریان بوو بەنەمرو بەسەر چەرخو ئاسۆکاندا درێژبوونەتەوەو، تەنانەت لەسایەی ئەو شوێنەوارەی ئەواندا نەوە لەدوای نەوە پێگەشتنو تێگەشتن، لەم چەن دێرەی دیکەدا تۆزقاڵێ خێرا هەر بۆ موفەرکیو بەرەکەت ناوی ئەو زاتانە دەهێنین: **((مالیکی کوڕی ئەنەس، ئەبو حەنیفە (نوعمان)، موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی، ئەبو عەبدوڵلا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لەیسی کوڕی سەعدی ئەلمیسری، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەمری ئەوزاعی، موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری، موسلیمی کوڕی حەججاجی قوشەیری، موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی غەزالی، تەقیێددینی کوڕی تەیمییە ( ناسراو بە شەیخولئیسلام)، موەفەقوددینی**

کوڕی قودامە، ئەبو ئیسحاقی شاتبی، کەمالی کوڕی هومام، ئەحمەدی کوڕی عەبدولڕەحیمی دیهلەویی ..) ئەمە سەرباری جیاوازیان لەڕووی کات و زەمانەوە، هاوکات لەڕووی ڕەسەنایەتی زانستو بەرزی کارو کردەوەیانەوە. تەماشای تێکرای ئەم کەڵە پیاوانەم کرد، کە هەریەك لەلای خۆیەوە دوو ڕەکعات نوێژی (دیاری مزگەوتی_تحية المسجد) بەملکەچی‌و قنووتەوە ئەنجامداو، دواتر زۆر بەئەدەب‌و خۆبەکەمزانینەوە لە گۆڕی پیرۆزی ئەو پێغەمبەرە نازدارە (د.خ) نزیکبوونەوەو بەچەن ووشەیەکی کوورتی پڕماناو، ڕەگ داکوتاو و سەر لە ئاسۆدا، سڵاویان لە پێغەمبەرە نازدارەکەیان (د.خ) کرد، وەك ئەوەی لەچاوانیان فرمێسکی قەتیسکراو و لە دەنگیاندا ملکەچی بەدی بکەم‌و بە گوێمدا بچرپێنن‌و بڵێن: "ئەی پێغەمبەری ئازیز(د.خ) گەر تۆ و شەریعەتە لێبووردەو بەرفراوان‌و نەمرەکەت نەبایەو، ئەو بنەمایانەش کە هەڵوەشێنەری زشتی‌و ناشیرینیەکانن‌و، هاوکات ئەو ئاکارو ڕەووشتە دانا‌و موعجیزانەی کە سەرچاوەی بیرکرنەوەو زادەی تێکرای شتەکانەو، هاوڕێ لەگەڵ ئەو پێویستیەی مرۆڤ لە هەموو زەمان‌و کاتێکدا بەشەریعەتەکەت هەیەتی، ئەوا هەرگیز ئەم فیقهە گەورەو شەرعە دانایەی؛ کە هیچ ئومەتێك لەئوممەتان‌و کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان، پێیان هەڵنەدەگیراو، نەدەنووسرایەوە، هەروەها ئەم کتێبخانانەی کە تەژییە لەپەرتووك‌و کۆی کتێبخانەکانی دونیا لاوازە لەچاو ئەودا، گەشەی نەدەکردو پەرەی نەدەسەند، هاوکات گەر تێکڕای ئەو هەوڵ‌و کۆششانەی لەپێناوی بڵاوکردنەوەی زانستو بەکارهێنانی عەقڵ‌و بیرکرنەوە لە ئایەتەکانی خودا نەبایە، ئەوا هەرگیز زانست

**نەدەگەییە ئەوەی ئەمڕۆ پێیگەشتووەو عەقڵی مرۆڤ و جیهانیش بەگشتی بەم چەشنە ئازاد نەدەبوو لە هەموو کۆتو بەندێك کە نەفامان و کاڵفامان و ستەمکاران کردوویانەتە ملی عەقڵ و ئاوەز".**

من لە ئاتاجی (*لَبَاَنَتي*) قسەکانم دەربارەی ئەم کۆمەڵە نەبوو بوومەوە، لەناکاو چاووم کەوتە سەر بەشێکی دی؛ کە لەدەرەگای (ڕەحمەت)ەوە هاتنە ژووری، سیمای چاکی و پاکی و خۆشبەختیان پێوەبوو، لەهەمان کاتدا ڕووخساریان شوێنەمای خوودناسی و خواناسیان پێوە نما بوو، پێم وترا لەو کۆمەڵەدا هەریەك لە: "**شێخ حەسەنی ئەلبەسریی و، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو، سوفیانی سەورییو، شێخ جونەیدی ئەلبەغدادیی و، فوزەیلی کوڕی عەییازو، داوودی تائی و، ئیبنول سەمماك و، عەبدولقادری گەیلانی و، نیزامووددینی ئەلبەدایۆنی و، عەبدولوەهابی ئەلموتتەقی و (خوایان لێڕازی بێت)**"[٣١]. چەندانی تری چەشنی ئەم گەوهەرو پیاوە باشانای وەك کەڵە پیاوانی سەرەتاکانی ئیسلام هەژمار دەکرێن، لەخۆگرتووە.

وەك باسمان کرد تێکرای ئەمانەم بەدی کرد، دوای نوێژ یەك بە یەك هاتن و لەبەردەم گۆڕی پڕ نووری پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) وەستان و سلاویان لە پێشەواو سەروەرەکەیان کردو وتیان: "**ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) گەر کۆی ئەو داستان و چیرۆکە عەمەلییانەی کە**

---

[٣١] - ئەم دوانەی ئەخیریان( دووزانای خواناسن، لەگەورە پیاوان و خواناسانی وولاتی هیندن؛ کە هەر لەوێ لەدایك بوون و لەوێش بەخاك سپێراوون). دانەر

لەماوەی ژیانتا بەسەردا هاتووەو تێکرای ئەو بەیداخەش نەبایە کە بۆ ئەوانەی دوای خۆتت هەڵداوەو، هاوکات ئەو وتە جوانەشت نەبایە کە فەرمووتە (( ژیان تەنها ژیانی ڕۆژی دوایی‌و ڕەستاخێزە))و ئەو وەسیێتەشت نەبوایە کە فەرمووتە (( بەچەشنی نامۆو ڕێبوارێك لە دونیادا ژین بگوزەرێنن))و ئەو ژیانەی ڕۆژانەشت کە دایە عائیشەی حەرەمت بۆی پەسن کردووین‌و فەرموویەتی (( مانگ هاتووەو چووە نە ئاگر لە ماڵی پێغەمبەردا (د.خ) کراوەتەوە، نە مەنجەڵیش خراوەتە سەر)) ئەوا هەرگیز نەمان دەتوانی فەزڵی ئاخیرەت بدەین بەسەر دونیاداو بەتەنها پشکێکی کەمی ئەم ژیانی دونیایە رازی بین‌و پشت لەو هەموو حەزو ئارەزوو بازییە بکەین‌و دواجاریش بەرهەڵستی هەموو ئەو پلەو پایەو سەروەت‌و سامانە ببینەوە کە لەم ژیانە کورتبڕەی دونیادا دێتە بەردەستمان، سەرباری ئەوەش کۆی ئەوسەروەت‌و سامانەی کە بەچەشنێکی حەڵاڵ وەدەست دێت بەحەڵاڵی دەزانین، چونکە ئێمە تەنها قسەمان لەسەر ئەو شتانەیە کەبە چەشنێکی نا درووست‌و حەرام مرۆڤ وەدەستی دێنێت". هێشتا من لە چێژی گوێهەڵخستنم بۆ ئەو گفت‌وگۆیەی لەنێوان ئەوان‌و پێغەمبەردا (د.خ) ڕوویدا، نەبوومەوە، لەپڕدا کۆمەڵێ دیکەی ئافرەتم لە دەرگای ژنانەوە (نساء) وەدی کرد کەئافرەتانێکی داپۆشراوی خاڵی لەهەموو ئەوشتانەی ئیسلام بەدڵی نییەو، هاوکات تەژی لە تێکرای ئەو شتانەی کە برسیانی جەستەو لاشەی ئافرەت‌و غەرەبزەدەکان بەدڵیان نییە، هەریەك لەو کەڵە ژنانە لە وڵات‌و مەملەکەتی جودا جوداو گەل‌و نەتەوەی دوور دوورەوە سەریان بە مەدینەکەی پێغەمبەری نازدارەوە

نابوو، بەو هومێدەی نالی واتەنی لەو خاكە چاكە لەو تەیبەی كەشوێن‌و مەئوای حەبیبە دەرمانی دڵان‌و برینی بەسوێی ڕۆحیان دەست كەوێت. ئەوانە كۆمەڵە ئافرەتێكی بەشەرم‌و حیشمەت بوون، ژنچا ك[٣٢] و داوێنپاك، لەعەرەب‌و عەجەم، لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا، لە هەموو كون‌و قوشبنێكی ئەم زەمینەوە هاتبوون بۆ شارەكەی سالاری مەدینە (د.خ) هەریەك بەدەنگێك هەریەك بەزمانێك دەیچریكان‌و گۆرانی بەسەر خۆشەویستەكەی خۆیدا ئەچڕی، ئای دەبێت ئەوانە بە چ نەزاكەتێكەوە، بە چ سەعادەت‌و خۆشبەختییەكەوە، بە چ سینە پاكی‌و ئارامییەكەوە، ڕێگای چەند ڕۆژو مانگ‌وساڵیان تەیی كردبێ‌و بۆ خزمەتی سەرداری مرۆڤایەتی (د.خ) ملی ڕێیان گرتبێتە بەرو بەسۆزو نەعرەتەو زایەڵەی دەروون‌و ڕۆحەوە هاتبنە خزمەتی ئەو زاتە پاكە (د.خ)، ئەی دایك‌و باوكمان قوربانی ڕێگەكەت بێ ئەی بادی خۆشنوودی بەیانیان، ئەی ئەو كەسەی كەشافیع‌و تكاكاری بۆ گشت تاوانباران، هەردەم داواكارم لەخودای مەزن‌و دلۆڤان، من‌و دایك‌و بابم‌و تێكرای ئەوانەش كەبەتایبەت خوێنەری ڕاستەقینەی ئەم وەسفە هیچ لەبارانەبووەو كەمەن، كەلەم پەرتووكەدا ئاماژەم پێێكردووەو هەموو ئەوانەش بەو پەری خۆشەویستی‌و تاسەوە دەڕواننە ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (د.خ) بكات بەقوربانی‌و، بمانخاتە بەر شەفاعەتی(د.خ)ئەو شافیعە، وەك مەحوی گەورە دەفەرموێت:

---

[٣٢] - ووشەی ((ژنچاك))م لە بەرامبەری ووشەی ((پیاوچاك))ەوە دانابێت، بەو هیوایەم هەڵە نەبووبێتم. غوڵامی

بێ حیسابە گەر گوناه، باکم چییــەا

حەزرەتی ئەو شافیعە، ڕۆژی حیساب

بەر شەفاعەی ئەو شەفیعەم خەی، خودا

خۆشم‌و ئەحباب‌و ئەهل‌و داک‌و بــــاب

هەروەها مەحوی گەورە بەمەحزوونییەوە، لەڕوانگەی هەست‌و سۆزی پێغەمبەرەوە (د.خ) سکاڵا لەدەستی ئەسیری ئەم ئوممەتە لەدەستی شەیتان دەکات‌و دەفەرموێت:

یەکێ پرسی: کە پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ ئەم شەوکەت‌و شانە

چ موجیب موتتەسیل پڕ فیکرەت‌و دائیم بە ئەحزانە

لەپاش ((ئەلف‌و ئەوەندە)) ئەم جوابە جوانەی دایەوە شەیتان

ئەمەی دیوە کە ئوممەت وا ئەســــــیری نەفس‌و شەیتـــــانە

بەڵێ ئەو کۆمەڵە ئافرەتە بە دەنگێکی هێمن‌و ئەسپاییەوە هاتنە خزمەتی‌و(د.خ) بەئەدەبەو سڵاویان لێکردو سەڵاواتیان بۆ دیداری بەرزو پیرۆزی هەناردە کردو وتیان:" ئەی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) سەڵات‌و سەلامت لێبێت! بە ئیزنی خودا جەنابت لەنەریتی نەزانیی‌و ستەمی کۆمەڵگە‌و زوڵمی پیاوان رزگارت کردین، تەواوی خەڵکت لە ئازاردانی دایکانیان ئاگادارکردەوەو وانەت دادان‌و فەرمووت:" بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە"، بەوەشەوە نەوەستایت ئافرەتانت

**بەشێوەیەکی ڕەهاو بێ جیاوازی لەنێوان هەژارو دەوڵەمەند، بەندەو ئازاد، بەشدارکرد لە میراتداو پشکی هەریەکەیان لە دایكو خوشكو کچو ژن، بە دادپەروەرییەکی ئاسمانی دیاری کرد، تەنانەت لەدواهەمین وتاری ڕۆژی عەرەفەدا ئێمەت لەبیرنەکردو فەرمووت:" لەهەمبەر ژنەکانتانا لەخودا بترسن؛ چونکە ئەوانتان وەك ئەمانەتێك تەسلیم کراوە" ئەمەو چەندانی تریش لەو مافو دەستورانەی لە بەرژەوەندی ئافرەتان نەخشەت بۆ کێشاوە، لەوانە لەچەندین شوێنو کاتدا پیاوانت هانداوە کە دادپەروەرو باشبن لە مامەڵەکردن لەتەك خێزانەکانیانو بەو پەڕی ڕێزو شکۆوە تەماشایان بکەن، دەسا خودا بۆخۆی لەبری ڕەگەزی ئێمە بەو هێندەیەی کە پاداشتی پێغەمبەرانو بەندەکانی خۆی داوەتەوە، پاشتت بداتەوە".**

ئەم دەنگە نەرمە لە گوێیەکانم نەپچڕا، تا هەستی بیستنم چووە سەر تاقمو گرۆهێکی دی، کەلە دەرگای (سەلام)وە دەهاتنە ژووری، لام بە لادا کردنەوە دیتم ئەو دەستەو تاقمو کۆمەڵەن کە داهێنەرو نووسەری زانستو هونەرن، کە لە پێشەوایانی زانستی نەحو و زمانو ڕەوانبێژی پێك هاتبوون ئەمانەی خوارەوە سەردەستانیان بوون:" **ئەبو ئەسوەدی دوئەلی، خەلیلی کوڕی ئەحمەدی ئەلفەراهیدی ( داهێنەری زانستی کێشو عەرووز – لەشیعردا–)، سیبەوەیهی (گەورە زانای نەحو)، کیسائی، ئەبو عەلی ئەلفارسی ( خاوەنی پەرتووکی: البغدادیاتو حلویات...)، عەبدولقاهیری ئەلجورجانی، سەککاکی، ئیبنولمەنزوور، مەجدوددین ئەلفەیرووزئابادی، سەید مورتەزا زوبێدی)**

تێکرای ئەم کەڵە زانایانە هاتوون‌و دەیانەوێ پاداشتی ئەو نێوبانگەیان کە بەهۆی قورئان‌و پێغەمبەرە ئازیزەکەیانەوە (د.خ)دەستگیریان بووە بدەنەوە، هاوکات سەرانەی خۆیان پێشکەش بەپێشەواکەیان (د.خ) بکەن، بۆیە بەوپەڕی نەزاکەتەوە گوێم لێبوو دەیانووت:" ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) گەر ئەو پەرتووکە نەبایە کە بۆت نێردراوەو، ئەو فەرمایشتانەی جەنابت نەبایە کەفەرمووتەو، ئەو شەریعەتە پاکە نەبوایە کە گەلان لەپێناوی فێربوونی زمانی عەرەبی‌و تێگەیشتنی پەیڕەوی دەکەن، ئەوا هەرگیز کۆی ئەم زانستانەی کە بووە بەتاجی شەرەف بەسەر ئەم ئومەتە بێهیمەتەی کەداییم بەئەحزانە گەشەی نەدەکرد، هاوکات نە نەحو و نە زانستی ڕەوانبێژی بوونیان نەدەبوو و نەدەتوانرا ڕۆژێك لەڕۆژان بخرێنە سەر پەڕەی نوێ، بەهەمان چەشن نەدەتوانرا هەموو ئەو فەرهەنگە گەورانە بنووسرێ‌و وردەکاری‌و، وشەسازی لەزمانی عەرەبیدا ئەنجامدرێ، نەشماندەتوانی لەپێناوی ئەم ڕێبازەدا ئەو هەمووە هەڵ‌و کۆشش‌و پشوودرێژییە بگرینە ئەستۆ، سەرباری ئەمانەش هەرگیز عەجەم کە دارای زمانێکی بەرفراوان‌و حەسوودییان بەزمان‌و شێوەزاری خۆیان دێ، ملکەچ نەدەبوون بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی زمانی عەرەبی، دواجار هەرگیز ئەو کەڵە زاناو پیتۆڵانەی کە تێکڕای ڕووناکبیران‌و ڕۆشنفکران‌و بیریارانی عەرەب دان بەزانایی و بلیمەتی‌و فەزڵ‌و گەورەییاندا دەنێن درووست نەدەبوون‌و نەدەهاتنە کایەکەوە، ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) تۆ ئەو پەیوەندییە بوویت لە نێوان ئێمەو ئەو زانستانەی کە زادەی سکی ئیسلامن‌و، لە سەردەمی پەیام‌و پێشەوایەتیەکەی جەنابتانا (د.خ)

چەکەرەی کرد، هاوکات ئەوە تۆی کە بوویت بەپەتی پەیوەندی نێوان عەرەبو عەجەمو، فەرمووتە: تاکە جیاوازی لەنێوان عەرەبو عەجەمدا "لەخواترسانە".

تۆ ئەو کەسەی کە خودا ئەو بۆشاییەی پێپڕکردیتەوەو، دوورت بەنزیكو، عەجەمت بەعەرەب گەیاند، ئای دەبێ چەندە فەزڵو گەورەییت لەسەر پێگەشتنو بلیمەتیو پیتۆڵی ئێمەوە هەبێت! دواجار دەبێت چەندە فەزڵت لەسەر سامانی زانستو بەرهەمی عەقڵو داهاتی پێنووسەوە هەبێت!.

دەتوانین هەر ئەوەندە بڵێین کە مەحوی گەورە شاعیر لەپەسندتا فەرموویەتی:

چ مەدحێکت بکەم لایق بە تۆ (( یاخیر خلق الله)

منـــی بێخێری نالائیق کە جیبریلت سەناخوانــە

ئەتۆش ئەی نەفسی بەد تینە، بەبێ جێ دڵ مەسوتێنە

لـــەبەر کەسرو کەمی دونیا، بەسە ئـــەم شینو گریانە

بەزیکرو فیکری شیمەی موستەفا (د.خ) وەتقتت موسەففا کە

کە باسی ئەو سەفا بەخشە، تەرەب خێزە، دوڕئەفشانە

ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) گەر تۆ نەبوویتایە، ئەوا زمانی عەرەبی وەك هەر زمانێکی دی دونیا بایەخی نەدەماو لەنێو دەچوو، گەر

قورئانی پیرۆز نەبا ئەوا زوان عەرەبی وەك زۆرێك لە زمانەكان، دووچاری شێواندنو تەحریف دەبوویەوەو زمانی عەجەمیو شێوەزاری نێوخۆیی قووتییان دەداو هەڵەو كەمو كوڕی زاڵدەبوو بەسەریدا، بەڵام ئەوە شەریعەتە ئەمرو دینە جیهانییەكەی جەنابتو پەرتووكە موعجیزەكەی خودایە؛ كە ڕێگر بووە لەبەردەم تێكڕای ئەو خۆڵو خاشاكەو شێواندنی زمانە راستەقینەكە[٢٣]، هاوكات هەر ئەو زمانەیە دەسەڵاتو هەژموونی خۆی سەپاندووە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بەگشتیو، خۆشەویستیو شكۆی لەنێو دڵی هەموو موسوڵمانێكدا چاندووە، ئەوەش بەهۆی جەنابتەوە بوو كە خودای گەورە نەمریی و مانەوەی هەتا هەتاییو بڵاوبوونەوەو پارێزگاری كردنی گرتە ئەستۆی خۆی، كەوابوو هەركەس قسەی پێبكا یان پێی بنووسێ یان بەوەوە بژیو بەو زمانە بانگی خەڵكانی تر بكا؛ ئەوا لەبەرامبەردا هەموو فەزڵو گەورەییەكەی هەر بۆ جەنابت دەگەڕێتەوە".

---

[٢٣]- خۆم زۆر جار هەستی ئەوەم لا درووست دەبێت، كە ئەم قورئانە بەهیچ چەشنێ لەزمانی عەرەبی ناچێو چەندین ڕێساو یاسای تێدایە كە عەرەبی بەهیچ شێوەیەك لەخۆی نەگرتووە یان بەچەشنێكی سەرسوڕهێنەر جیازازی لەتەك قورئاندا هەیە، بەڕادەیەك زۆر یاسا لەزمانی عەرەبیدا هەیە، قورئان تێی پەڕاندووەو لەدوایشدا كە تەماشای دەكەیت و تێدەفكریت دەبینیت گەلێك لە یاساكە جوانترە، دواجار ئەم قسەیەی من كە دەیڵێم مانای ئەوە نییە كە ئاگام لە ئایەتی ﴿ بلسان عربیّ مبین﴾ نییە، ئاگام لێیەتی بەڵام ئەم بۆچوونەی من زۆر جیاوازە لەنێوەرۆكی ئایەتەكە. غوڵامی

چەندە قەشەنگ مەحوی لە شاکەرەکەیدا کەبۆ جەماڵی پێغەمبەری مەزنی (د.خ) ووتووە، فەرموویەتی:

لەبی ڕۆحی ڕەوان و نێوچەوانی ڕۆژی لێدەتکێ

زوبانی تا شەکەرڕێزە، دەهانی گەوهەر ئەفشانە[٣٤]

مەلاحەت مەحوی دیداری، حەلاوەت وەقفی گوفتاری

تەراوەت نەزری گوڵزاری، کە ڕەشکی باغی ڕیزوانە[٣٥]

کەسێ جێ هەڵتروشکانێکی لەو بەر قاپییە دەست کەوت

بەعاری دێ، بڵێن: ئــەم جێگە وەك تەختی سولەیمانە[٣٦]

---

[٣٤]- واتە: قسەی ئەوەندە خۆش و بەتامە ڕۆح لەلێوی دەتکێ و، ناوچاوانی ئەوەندە جوانە ڕۆژی لێدەبارێ و تا قسە بکا زوبانی شەکری لێدەوەرێ، دەمی هەر گەوهەر بڵاو دەکاتەوە، واتە ددانەکانی دەردەکەون. مەلا عەبدولکەریمی مودەرریس (دیوانی مەحوی). *غوڵامی*

[٣٥]- مەلاحەت: کینایەیە لەجوانی. حەلاوەت: شیرینی. تەراوەت: تەڕی و پاراویی. ڕەشك: خەفەت، بەخیلی بردن. ڕیزوان: بەهەشت. *غوڵامی*

[٣٦]- واتاکەی زۆر ئاشکرایە. *غوڵامی*

**ئەوەندەی لێ ئەزانم بەم نەزانی خۆمەوە ((مەحوی))**

**بـــەچاوی سەر خودا بینە، بە چاوی دڵ خـودازانە** [37]

**لە م دێرەی دواهەمی مەحوی‌دا شاعیری گەورەی تاوگۆزی ((مەولەوی)) سەنگین، هەمان دێڕی هەیە دەربارەی میعراجی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) بەڵام بەچەشنێکی دی، کە دەفەرمووێت:**

**چوو، بوو، دیی، بیستی، کریا، دریاوە**

**هاتـــەوە حـــەلقە هـــەر نەلـــەرزیاوە**

**واتە: چووە بەیتولمەقدیس‌و (بوو) لەوێشەوە ڕۆشت بۆ ئاسمانەکان‌و (دیی) زۆر شتانی بینی بەچاووی سەری موبارەکی، (بیستی) زۆر شتی بیست، ( کریا) هەموو شتێکی لەدەرگای ئاسمانەکان‌و لەنهێنی‌و ئەو کاروبارانەی کە بۆ براکانی دیکەی نەگونجا [38] بەدی بکەن‌و ببینن ئەم**

---

[37]- **واتە: هەر ئەوەندەم پێدەکرێ لەبابەتی میعراجەوە بڵێم: لەو سەفەرەدا بەچاوی سەر خودای دی‌و بەچاووی دڵیش ناسی.** ***غوڵامی***

[38]- **مەحوی گەورە دەقی ئەم قسەیەی لە شابەیتێکدا کورت کردۆتەوە کە دەفەرمووێت:**

**کەکلیم الله﴿أرنی﴾ فەرموو، هەر جوابی ﴿ لَنْ تَرَانی﴾ی بوو – موشەڕڕەف بوو موحەممەد بێ تەڵەب بەو مەرتەبە و شانە. واتە: حەزرەتی مووسا کە دوای لەخودا کرد خۆی پیشان بدا. وای وەڵام دایەوە کەوا نایبینێ. کەچی حەزرەتی موحەممەد بێئەوەی داوای چاوپێکەوتنی خودای کردبێ، خوا خۆی پیشاندا.** ***غوڵامی***

زاتە تێکرای ئەو شتانەی بەدی کردو بیستی‌و، هاتەوە ئەڵقەی قاپییەکەی هەر دەلەرایەوە، کە هەندێ لەزانایان دەفەرموون: "جێگەکەشی سارد نەبووبوویەوە. بەڵێ ئەمە بۆ خودا شتێکی گەلێك ئاسانە؛ چونکە لەو کاتی شەو ڕویەدا کات نامێنێت".

لەم گفت‌وگۆیەی ئەواندا هۆشم ڕوا بوو، ئەوەندەم زانی هەر لەخۆمەوە هۆش‌و هەستم چووە سەر، کۆمەڵێکی تر کە لە دەرگای (**عەبدولعەزیزە**) وە دەهاتنە ژوورێ، تێکەڵەیەك لە مرۆڤو پێکەڵەی چەن گەلێك بوون، لە گەورەترین پادشاو مەلیك کە مێژوو بەخۆیەوە بینیبوونی پێکهاتبوون، لەوانەش:" **وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك، هارونە ڕەشید، مەحمود ئەلخەزنەویی، مەلیك شای کوڕی ئەلەب ئەرسەلانی سەلجوقی، سەلاحەددین ئەلئەیوبی، زاهیر بەیبەرس، سولەیمانی کوڕی سەلیمی ئەلقانوونی ئەلعوسمانی، ئاورنك زێب عالەمکیر تەیمووریی هیندی**". خزمەتکارەکان‌و پیاوانی حەیتە (الشرطة) لێیان دوورکەوتنەوەو لەپشتی دەرگاکەوە بەجێیان هێشتن، ئەوانیش هەم بە سام‌و خۆبەکەمزانین‌و، هەم بە چاوداخستن‌و بێدەنگیی‌و ویقارەوە دەهاتنە پێشێ، هاوکات هەرچی شتێکیان لە ناوو نازناو و شۆرەت‌و ڕۆڵ‌و تێکرای ئەو شوێنانەش کە دەسەلاتیان بەسەریدا هەبووەو حوکمیان کردوون‌و گەلێك چێژیان لێدیبوو، لەو شوێنە پیرۆزەداو لەبەردەم پێغەمبەری خۆشەویستدا (د.خ) نمایشکردو خستەڕوو، لەنێو ئەو مەلیکانەدا هەیان بوو هێندەی موڵك‌و زەوی لەژێر دەستا بوو کە حوشترێکی زۆر خێرا نەیدەتوانی بەکەمتر لە

پێنج مانگ بیبڕێ[39]و، هەشیان بوو ئەو دەمەی پەڵە هەور دەکەوتە سەر ئاسمانی نیشتمانەکەی پێی دەووت:" لەکوێ دەبارێنی ببارێنە... لەهەر کوێ ببارێنی باج و سەرانەکەتم بۆ دێنن"[40]. هەیان بووە هێندە سنووری قەڵەمڕەویی بەرفراوان بووە، توانیویەتی فەرمان بکات لە دارایی شاری ئەنتاکییە کە دەکەوێتە ئەوپەڕی خۆرئاوای مەملەکەتەکەی کرێی هاوەڵانی جەیحوون کە دەکەوێتە ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتەوە بدات، وە کاتێك نێردراوی قەیسەر هاتووە بۆ ئەوەی باجەکەی پێبدرێت، لەدەرگای کاشغەرەوە نەبێت لێی وەرنەگیراوە[41]، هەیان بووە کە ئەورووپا بەو زەبەلاحییەی خۆیەوە سامی لێکردووە، بەڕادەیەك ئەو دەمەی موسوڵمانەکان ڕۆشتوونەتە شاراکەیان، بەخاتری ڕێزیان کڵێساکان زەنگیان لێنەداوە[42]، هەربەم چەشنە چەندان و چەندانی دیکەی تریش...

تێکرای ئەم مەلیك و پادشایانەم بینی کە هاتبوون بۆ ئەوەی لە مزگەوتی پێغەمبەردا (د.خ) نوێژ ئەنجامبدەن و، سڵاو لەهەر دوو هاوەڵی بەرێزی بکەن، وایان دەزانی کە خۆشەبەخترین کارێك یان گەورەترین شەرەفێك کە پێیان رابینرابێ، ئەو دوو رکاتە نوێژە بووە کە لەخزمەت جەماڵی بەرزی ئەو نازدارەدا (د.خ) ئەنجامیان داوە،

---

[39] - مەبەست لەو کەسە، وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکە. *غوڵامی*

[40] – مەبەست لە هارونە رەشیدە. *غوڵامی*

[41] - مەبەست لەو کەسە: مەلیك شای کوڕی ئەلەب ئەرسەلانی سەلجوقییە.

[42] – ئەو کەسە: سولەیمانی کوڕی سەلیمی ئەلقانوونی ئەلعوسمانییە.

بەئاواتەوە بوون کە خودای گەورە ئەو نوێژو پەرستش‌و پاڕانەوەو وەستان لەبەردەم گڵکۆی پیرۆزی پێغەمبەردا (د.خ) قەبوڵکردبێ. بەڵێ هێمن هێمن بەهەنگاویی کوورت‌و هەڵنووتانی (تعثر) قاچەکانیانەوە دەمبینین دەهاتنە پێشێ، بە ئەندازەیەك سام‌و هەیبەت دڵیانی تژی کردبوو تا ئەوەی گەشتنە لای ( سوففە) -کە لە چینی هاوەڵانی هەژار بوون- بە ویقارو نەزاکەتی جارانەوە لەبەردەم ئەو پۆلە هاوەڵەدا وێسیان بە چەشنێکی گەورەیی شکۆو شەرمی ئەوان‌و نۆکەریی‌و بەردەستەیی ( إحتشام) خۆیان تەماشایان دەکردن، لە تەنیشتیانا نوێژی دیاریی مزگەوتیان بەجێهێناو، دواتر بەرەو گۆری پێغەمبەری نازدار (د.خ) بەڕێکەوتن‌و سەلامیان لێکردو، هەرچەندە توانایان هەبێ ڕێزو تەقدیرو شکۆیان لەهەمبەر پێغەمبەر گیانا (د.خ) بە ئادابی شەرعی‌و پەیڕەوی یەکتاپەرستییەوە ئەنجامدا، گوێم لێبوو دەیانوت:"
**ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) ! گەر تۆ نەبایەو، ئەو جیهادو بانگەوازەت نەبایە کە هەموو ئاسۆکانی داگرت‌و وڵاتانی ڕزگارکرد، هاوکات ئەو دینەی تۆ نەبوایە کە باوکان‌و دایکانمان باوەڕیان پێهێناو لەژیانی تاریکستان‌و ملکەچی‌و کەنارگیری لەجیهان بۆ ژیانێکی شەرەفمەندانەو هەوڵ‌و کۆشش‌و جەربەزەیی دەربازبوون، کە چەندین دەوڵەت‌و وڵاتی بەرفراوانیان ڕزگار کردو سەرانەو باجیان لەو ئوممەتانە سەند کە خەڵکەکەی خۆیان بەدار مڕەداو وەك ئاژەڵ بەخێویان دەکردن، وە گەر ئەم گواستنەوەیە لەنەزانییەوە بۆ ئیسلام‌و لە خۆپێچدانی دەروون‌و ژیانی هۆزو تیرەی تەنگەبەرو تاریکەوە بۆ ڕزگارکردنی جیهان‌و فەتحی وڵاتان نەبوایە، ئەوا هیچ کات نەدەبووین بەخاوەنی ئاڵاو بەیداخی**

خۆمان‌و وەك هەواڵێکی بێ ئەسەرمان لێدەهات‌و لەهیچ شوێن ناومان نەدەبوو، لەو بیابانە وشك‌و برینگ‌و، لەو دۆڵە تەنگ‌و تاریکەکانشدا دەماینەوەو هەردەم لەململانێ‌و پێکهەڵپڕژاندا بووین، بەهێزەکان مافی گەداو لاوازەکانیان پێشێل دەکردو گەورە ستەمی لە بچووك دەکرد، خواردنیشمان گەداترین خواردن‌و، ژیانیشمان کولە مەرگی‌و بژیی مەمرە دەبوو، هەرگیز نە بیرمان لە شوێنێکی فراوانتر لەو گوندە بچووکەی کە ژیانمان تێدا دەگوزەران دەکردەوەو نە بیرمان لە کۆمەڵە مرڤێکی دی کە ژمارەیان لەم بەشە کەمەی گوند زۆر تربێت دەکردەوە، تا ئەوەی پەیوەندیمان فراوانترو بەهێزتر بێ وەك ماسی ئەستێل‌و بۆقی بیرمان لێدەهات، هەردەم لە جیهانی دەروون‌و ئەزموونی سنووردارماندا دەژیاین‌و گۆرانیمان بەباڵای گەورەیی‌و شکۆمەندی باوباپیرانی دەبەنگ‌و نەزانماندا هەڵدەدا".

بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) تۆا لە دینەکەتەوە ڕووناکییەکت بۆ پەخش کردین کە چاوانی کردینەوەو ئەندێشەو خەیاڵی فراوانتر کردین، تا بەوپەڕی شانازییەوە بتوانین هەڵگری پەیام‌و پەیکەکەی جەنابت بین‌و، بچینە نێو ئەو زەوییە فراوانەی کە خودا بۆی فەراهەمهێناوین، ئەو ڕووناکییە بەمرە خەفەکراوو دۆگماکانی گرداین‌و، بەو کبیرتی چرایە[٤٣] توانیمان جەنگ لەدژی هاوبەشدانان‌و بتپەرستی‌و

[٤٣] - هەمان ئەو دەقە مەحوی لە شا بەیتێکدا ئاماژەی بۆ کردوەو بەچەشنێکی گەلێك جوان وێنای ژیانی دونیای کردووەو دەفەرموێت:

نەزانیو ستەم پەرپاکەین، بۆیە ئەم دەوڵەتە مەزنەمان بونیادناو لەسایەیدا خۆمانو ماڵو منداڵو خەڵکیش چەندین سەدە لەماندوێتی ئەو سەفەرە ناهەموارە حەساینەوەو پشووماندا، دەسا ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەوە ئێمەینو هاتووین دیاریت پێشکەش بکەین، ئەو ئێمەین باجی ڕێزو شکۆو خۆشەویستیو گەورەییت پێشکەش دەکەین، کە باجێکە بەچەشنێکی گوێڕایەڵیو ئارەزوومەندانەوەو بەو پەری شەرەفمەندییەوە پێکەشتی دەکەین، هاوکات دان بەوەدا دەنێن کە زۆر کەمتەرخەم بووین لەبەرامبەر ئەو دینەی کە کەچەندان سەدە دڵخۆشی کردینو عیرفانێکی هەتاهەتایی خستە نێو دڵو دەروونمانەوەو سازو کەیف خۆشی کردین، بەوەی کە بەڵێ خودایەك هەیەو ئاگاداری هەموو شتێکی ئەم مرۆڤانەیە کە لەسەر زەمین ئەنجامی دەدەنو، دواجار دەبێت دادی ئیلاهی ڕۆژێکی ئامادە کردبێت بۆ ئەوەی هەموو کەس مافو حەقی خۆی بۆ بسێنرێتەوە، کەوابوو گەلێك سوپاس ئەی سەرەوەرمان سڵاوی خوات لێبێت ئەوەندەی زمان حەزی لێبێتو بتوانێ بیڵێتەگۆ".

---

نەڵێ مەردم کە دنیا پشتی لە، ئەو ڕوو لە دنیا بێ
کەپووری زاڵە، بۆچی پیرە زاڵی پێرەوا نابێ!
لەبەر هەر دادەڕنرێ جل، چ پیناوی، چ چیناوی
دەبێتە لوقمە لوقمە پاقلە یا پاقلاوا بێ
برا، فکری چرا، کیبریتی فرسەت تا لەدەستایە
شەوی یەڵدا لەپێشە، ڕۆژی عومرت وەختە ئاوا بێ

من هەر چاووم بڕیبووە ئەو پادشاو مەلیکانە، لە ڕوخساریاندا ملکەچییم بەدی دەکردو لە گوفتاریاندا لەسەرخۆیی و ئەدەبێ کە لەوەو پێش نە دیبوم و نە بەگوێمدا هاتبوو. لەم مقۆمقۆیەی خۆمدا بووم، لەپڕێکا گرۆهێکی ترم بەدی کرد لە ڕیزی مەلیکەکاندا بێ بایەخدان و گوێپێدان ڕێیاندەکرد ، نە لەهێزو بازویان دەترسان و نە ڕێزیشیان بۆ دادەنان، وتم لەوانەیە شاعیران یان شۆڕشگێڕان بن، هەر ئەوەندەم زانی کۆمەڵێك بوون لە دوو تاقم، لەنێویاندا:" **جەمالوددینی ئەفغانی و، سەعید حەلیمی ئەمیرو**، سەرکردە **موحەممەد عەلی ئەلهیندی و، حەسەن ئەلبەننای گەورە شەهیدو**، شاعیری بەنێوبانگی تورکی **موحەممەد عاکیف و**، شاعیری سەنگین **موحەممەد ئیقبال**"م بەدی کرد، کە ئەمەی ئەخیریان بووبووە وەرگێڕی ئەوان و فەرمووی:" **ئەی پێغەمبەری ئازیز (د.خ) سکاڵام هەر بۆلای تۆیە! سکاڵا لەدەستی کەسانێك ئەمێستاش لە ژێر سایەی تۆدا دەژین و لە پارچە سفرەکەی تۆ دەخۆن و، لەو شارەی کە جەنابت لەدەستی حکومەتی ستەمکار رزگارکراو خستنتە بەر ڕووناکی خۆر دەخۆن و دەخۆنەوەو بەئازادی و بەو پەڕی شەرەفمەندییەوە دەژین، ئەوان نەیانەوێ ئەو بنەماو بناغەیەی کە ئەم ئوممەت و مەیدانە مەزنەی ڕاگرتووە هەڵوەشێننەوە، نەیانەوێ ئەو ئوممەتە یەککگرتووە بەسەر چەندین نەتەوەو ڕەگەزپەرستیدا بەش بەش بکەن، ئەوە زیندووبکەنەوە کە تۆ لەنێوتبردو ئەوەشی کە تێك‌وپێکتدا سەرلەنوێ چێی بکەنەوەو ڕۆحی بەبەردا بکەن، هاوکات ئەم ئوممەتەی کە بۆ جاویدان لە کەندەڵانی نەزانی و نەفامی دەرتهێنا دیسانەوە بگەڕێننەوە بۆ ئەو دەمەو، لاسایی ئەورووپای ونبوو و سەرگەردان و**

مایەپووچ بکەنەوەو، تێکرای نازو نیعمەتە لەبن نەهاتووەکانی خودای گەورە بە بێباوەڕی‌و دووری لە شەریعەتە پاکەکەی تۆ بکۆڕنەوە.

گومانی تێدا نییە سەر لەنوێ ململانێ لەنێوان چرا پرشنگدارەکەی تۆ و پریشك‌و پزوسکی ئەبولەهەبدا گەڕاوەتەوە، زۆرێك لەوانەی بەنێوی تۆوە قسە دەکەن چوونەتە نێو سەربازگەی ئەبولەهەبەوە. دین‌و گۆرانی‌و بەزم‌و بالۆرەی ئەو سەردەمە نەزانییە دەچن کە جەنابتان لەنێوتان برد، ئەوانە لەچینی کەمفرۆشانن (المطففون) کە ئەو کەسانەی شتێ لەخەڵکی دەسێنن‌و دەبێت هەموویان پێشی بدەن‌و، وە ئەگەر خۆشیان بۆیان پێوان یان بەکێشانەیان پێیدان، لێی کەمدەکەنەوە[٤٤]، تێکڕای ئەو شتانەی بەهۆی تۆوە دەستیان کەوت لە چاکەو شکۆمەندیی و گەورەیی‌و ئاکار، هەموویان بە زایەدا، پاش ئەم هەموو بەدکارییە دەیانەوێ پێشی سەری کۆی ئەو خەڵکەی بەدرێژایی چەندان ساڵ حوکمیان کردوون بگرن‌و بیخەنە نێو کۆشی ئەورووپاو فەلسەفەی بەنێو قەومییەت‌و ئیشتراکییەت‌و شیوعییەتەوە، ئەو بتانەشی کە جەنابت لەنێو جەرگەی کەعبەدا دەرتهێناو تێك‌وپێکتدا ئەمێستا بۆ کۆشی گەل‌و نەتەوە موسوڵمانە سەلامەت‌و بێتاوانەکە سەر لەنوێ‌و بە پۆشاکێکی تازەوە گەڕاونەتەوە یان گەڕێنراوەنەتەوە، بەڵێ قوربان من تێکرای ئەمانە بەچاوی سەر لە بەشێکی جیهانی وڵاتانی عەرەبیدا بەدیکرد کە دەبوایە

---

[٤٤]- ئەم چەن دێرە وەرگێرانی ئەو سێ ئایەتەی سوورەتی ( المطففون)ە. غوڵامی

**سەربازگەی شۆڕشێك بوونایە نە فارووقو نە ئەبوبەکری پێویست نەبوایە. دەسا خۆشەویستم (د.خ) لەمنەوەو لە تێکرای ئەو هاوەڵانەی کە شەرەفمەندم بەوەی لەوێژدانیانەوە بوومەتە نوێنەری وانو بەنێویانەوە قسەدەکەم، باشترینو جوانترینو قەشەنگترین سەڵاتو سەلامت لێبێ، دڵنیابەو خوداش بە شایەت بێت لەوەی کە دەیڵێم؛ ئێمە بەرین لە تێکڕای ئەو پادشاو مەلیکانەی ڕوویان وەرگێڕاوە لەدینەکەتو ڕوویان کردۆتە ڕۆژئاواو، ئەوانەی کە نەپەیوەندیان بەتۆوە هەیەو نە کاریان بەدینەکەشت ماوە، ئێمە هەردەم دان بەوەفاداریو خۆشویستیمان لەهەمبەر تۆدا (د.خ) دەنێینو بەردەوام تا ئەو ڕۆژەی بۆ لای خودای مەزن دەگەڕێینەوە دەستمان بە پەتی ئیسلامەوە گرتووەو خودا یار بێ هەر دەبێت وەك وەفادارێك بۆ ئایینە جوانەکەی جەنابت (د.خ) بمێنینەوە".**

هـــەر ئەوەنـــدەی لـــەم چـــەند ووتـــە ڕەوانبێـــژوو جوانانـــەی **ئیقبـــاڵ** بوومـــەوە، ئەوەنـــدەم زانـــی گـــوێم چـــووە ســـەر دەنگـــی بـــانگی مزگـــەوتی پێغەمبـــەر (د.خ)، **الله اکـــبر، الله اکـــبر، الله اکـــبر، الله اکبر**...ئیـــدی لەوخـــەوەی کـــە لـــەجیهانی خـــەیاڵو مێـــژوودا مەلـــەی دەکـــرد بێداربوومـــەوەو، زانـــیم کـــە مـــن لـــە بـــەردەم داکەوتەیـــەکی (**الواقـــع**) ڕاســـتەقینەدام، کـــە ســـات لـــە دوای ســـات پیـــاوانم لەنوێـــژدا بـــەدی دەکـــردو هەنـــدێکی دی خـــەریكو ســـەرقاڵ بەخوێنـــدنی قورئانـــەوەو، کۆمـــەڵێکی تـــریش لەموســـوڵمانو چـــەندین نوێنەریشـــم لـــە جیهانـــەوە بـــەدیکرد کـــە هـــاتبوونو ســـڵاویان لـــە پێغەمیبـــەری

نازدار (د.خ) دەکرد، ئیدی لەوێدا چەندان دەنگ‌و ڕەنگ‌و شێوەو نەوازش بوونیان هەبوو. ماوەتەوە کۆتایی ئەم چەند دێرە بە هۆنراوەیەکی مەحوی گەورە بێنم لەپەسنی پێغەمبەری نازداردا لەو شاکارە جوانەی کە لە سەدو بیست‌و چوار بەیت خۆی دەبینێتەوەو بۆ وەسفی پێغەمبەری ئازیزی (د.خ) نووسیوە، فەرموویەتی:

کە وەقتیٚ ئال‌و یارانی لەخدمەتیا دەبن وەك ڕۆح

حەیاتە، نووری چاوە، ئونسی جانە، مەحزی ئیحسانە

گەهیٚ دانیشتنی کێوێکی تەمکینت لەبەر چاوە

لە وەقتی ڕۆینیدا، هەر دەڵێی سەروە خەرامانە[٤٥]

ئەوی ساتیٚ لەبەر پێیا سەری تەسلیمی دانا بیٚ

ئەبەد مالیك ڕیقابی گەردنی تەسلیمی شاهانە[٤٦]

---

[٤٥] - گەهـ: کات. تەمکین: حورمەت‌و خۆبەقورس گرتن. خەرامان: ئەوەی بەنازەوە بەڕێدا بڕوا. غولامی

[٤٦] - واتە: پێغەمبەر(د.خ) زاتێکی ئەوەندە پایە بڵندو بەبەرەکەتە هەرکەسیٚ بۆ تەنها سەعاتیٚ سەری تەسلیم بوون‌و خۆبەدەستەوەدانی لەبەر پێیدا

## لە غاری حیرادا[٤٧]

ڕۆیشتمە سەر کێوی نوورو لەسەر غاری حیرا وەستام و بەخۆمم وت: هەر لێرە خودای مەزن ڕێزی لە پێغەمبەرەکەی (د.خ) ناو، بۆ یەکەم جار وەحی بۆ دابەزاند، لێرەوە ئەو خۆرەی کە ڕۆحێکی نوێ و ژیانێکی تازەی کرد بەبەری جیهاندا وەدەرکەوت، بەڕاستی جیهان لەدوای ئەو ڕۆژەوە هەموو ڕۆژێ پێشوازی لە بەرەبەیانێکی نوێ دەکات، زۆرن ئەو ڕۆژو بەیانیانەی کە جیهان پێشوازی لێکردوەو نە

---

دانابێ، گەردنی شاهان هەموو، بۆ هەمیشەو تا دونیا دونیایە دەکەوێتە دەستی ئەو و دەبن بەکۆیلەی. غوڵامی

[٤٧] - ساڵی ١٩٥٠ ز، لە وێستگەی سعودییە لە مەککە بڵاوکردەوە. دانەر

جیددیەتو نە خۆشبەختیو نە خێری تێدا بەدینەکراوە، زۆرن ئەو ڕۆژانەی کە جیهان پێشوازیان لە بەرەبەیان کردوەو تیایدا مرۆڤ بێداربوویەوە بەڵام مرۆڤایەتی نا، جەستە بێدار بوویەوە بەڵام دڵ نا، وەك مەحوی گەورە شاعیر دەفەرموێت:

وەنەوزێکم شەوێدا گەییە سەرمو ووتی:

هــەستە هــەتاووت وا لەسەر کــەووت

ڕۆژگاری تاریكو بەرەبەیانی درۆ لەمێژوویی جیهاندا گەلێك زۆرن، بەڵام لێرەدا بەرەبەیانێکی ڕاستگۆ هەڵهات کە نوورو ڕووناکییەکەی هەموو شتێکی گرتەوەو گەردوون تێیدا وەخەبەر هاتەوەو دواجاریش ڕێچکەی مێژوویی لەتەك خۆیدا گۆڕی.

ژیان تێکرا چەند قوفڵێکی ئاڵۆزو چەندان دەرگای داخراو بوو، عەقڵ داخراوبوو بە کردنەوەی دانایانو فەیلەسووفانی وشیار کردەوە، ویژدان قوفڵدرابوو بەوالابوونی واعیزەکانو ڕابەرەکانی بێدارکردەوە، دڵەکان داخراوبوون بەکردنەوەیان ڕووداو گەواهییەکانی ڕۆژگار هۆشیار کردەوە، بەهرەکان ئەڵقەڕێزبوون بە کەوتنە سەرپشت پەروەردەو فێرکردنو کۆمەڵگەو ژینگەی هۆشیار کردەوە، قوتابخانە داخرابوو بەکردنەوەی زانایانو مامۆستایانی بێدار کردەوە، دادگا داخرابوو بەکردنەوەی ستەمدیدەیانو دادگایکراوانی هۆشیار کردەوە، خێزان قوفڵدرابوو بەکردنەوەی بیریارانو چاکسازیارانی بێدار کردەوە، کۆشکی میران قوفڵدرابوون بەکردنەوەی گەلی ستەمدیدەو جوتیاری

پڕکۆشش‌و کرێکاری ماندووی بێدار کردەوە، گەنجینەی سەرمایەداران‌و پادشایان قوفڵدرابوون بەکردنەوەیان برسیی هەژاران‌و رووتی ئافرەتان‌و رەجاڵی لاوازانی وشیارکردەوە، زۆرێك لە پیاوەمەزنەکان‌و یاسادانەرە گەورەکان هەوڵیاندا قوفڵێك لەو قوفڵانە والاکەن، هەم دەستەوسان بوون‌و هەمیش خەسارەتمەند؛ چونکە ئەو قوفڵە کلیلی خۆی نەبێ بەهیچ کلیلێکی دی ناکرێتەوە، ئەوان چەندین سەدەیە ئەو کلیلەیان بزر کردبوو، سەرباری ئەوەی زۆرێك کلیلیان لە کارگەو کانگاکانیان بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایانە تاقی کردەوە بەلاّم سوودی نەبوو، ئەو کلیلانە بەو قوفلاّنەی نەدەکرد، هەندێکی دیکەیان هەوڵی شکاندنی قوفڵەکەیاندا بەلاّم بێ ئامانج بوو، دواجار هەم دەستیان بریندار بوو هەمیش ئامێرەکانی دەستیان شکا!

ئا لەم شوێنە خۆبەکەمزان‌و دبڕاوە لەجیهانی شارستانی‌و ژیاریەداو، لەسەر کێوێك نە بەپیتەو نە بڵندیشە، شتێك تەواوبوو و بە کۆتاهات کە لەهیچ پایتەختێکی ئەم جیهانە گەورەیەو لە هیچ قوتابخانەو کتێبخانەیەکی مەزن‌و گەورەدا تەواو نابێت، لێرەدا خودا بەناردنی پەیام بۆ پێغەمبەری مەزن (د.خ) منەتی کرد بەسەر تێکرای جیهاندا، هەر لەو پەیامەدا ئەو کلیلە ونبووە گەڕایەوە دەستی مرۆڤایەتی، ئەو کلیلەش باوەڕبوونە بەخوداو بە پێغەمبەرەکەیی‌و (د.خ) بە رۆژی دوایی، یەکەبەیەکی ئەو قوفڵە ئاڵۆزانەو هاوکات یەك بەیەکی دەرگا داخراوەکانی پێکردەوە، ئەو کلیلە پێغەمبەرێتییە لەسەر عەقڵە چەماوەکان دانراو کردنیەوەو چالاکبوون‌و توانیشیان بەهۆی

ئایەتەکانەوە سوود بە ئاسۆو دەروونەکان بگەیەنن‌و، بگەنە ئەو بنی دونیاو، لەفرەخواییەوە بۆ یەکخودایی‌و، هەست کردن بە ناشیرینی هاوبەشدانان‌و بتپەرستی‌و شتگەلی پڕوپوچ‌و گوماناویی، ئەو عەقڵانەی پێش هاتنی ئیسلام پارێزەرێك بوون کە لەسەر هەموو دۆزێك ئیدی چ چاك یان ناقۆڵاو زشت پاداشتدراونەتەوە. ئەو کلیلە خرایە سەر ویژدانی مرۆڤایەتی‌و بێدابوویەوەو، خرایە سەر مردوان بوژاندنیەوەو جارێکی دی ژینی بەبەردا کردنەوە ، ئەو کلیلە دەروونی فەرمانکار بەخراپەی (الأمارة بالسوء) بۆ دەروونی لۆمەکار گۆڕی‌و (لوّامة) دواتر کردی بەو دەروونە دڵنیاو جێگیرەی (المطمئنة) کە ڕێگە بە باتڵ ناداو گوناهو تاوان ناخاتە سەر ئەستۆی کەس تا تاوانبار بەپێی خۆی دێت‌و لەلای پێغەمبەردا (د.خ) دان بەتاوانەکەیدا دەنێت‌و، لەپێناوی لێخۆشبوونی خودا گەورەترین سزا قەبوڵدەکات، ئەوە هەر ئەو ئافرەتە تاوانبارەشە کە بێ هیچ چاودێرێك دەگەڕێتەوە بۆ بیابان‌و بادیەی خۆی‌و، دوابەدوای ئەوە هەر بەخۆی دێتەوە بۆ مەدینەو خۆی دەخاتە بەر بەئازارترین سزا کە گەلێك لە سزای کوشتن بەئێشترە، لەولاشەوە سەربازێکی هەژار تاجی کیسرا هەڵدەگریّ‌و لە ژێر پۆشاك‌و جل‌و بەرگەکەیدا دەیشارێتەوە؛ بۆ ئەوەی چاکەو ئەمانەتپارێزیەکەی نەکەوێتە بەرچاوی خەڵکی‌و نەبێتە ڕووپامایی، تاجەکەش دەسلیمی دەستی ئەمیرەکەی دەکات؛ لەبەر ئەوەی ماڵی خودا بەهیچ کلۆجێك دروست نییە ناپاکی پێوە بکات، ئەو دەمە دڵەکان قوفڵدرابوون نە پەندیان وەردەگرت‌و نە ڕێگریشیان لە هیچ تاوان‌و ناقۆڵاییەك دەکردو نە نەرمیش دەبوون، بەڵام ئەو دڵانە بەهۆی نووری پێغەمبەرەوە (د.خ)

بوون بەدڵانێکی ملکەچو وشیار؛ کە هەم پەندیان لە ڕووداوەکان وەردەگرتو هەمیش سوودیان لە ئایەتو گەواهییەکانو، دڵیشیان بە ستەمدیدەکانو چەوساوەو لانەوازان دەسووتاو بەزەییان بە لاوازو نەدارەکاندا دەهاتەوە.

ئەو کلیلە لەسەر هێزە خنکاوەکانو بەهرە لەکیسچووەکان دانراو، بەچەشنی ئاگر بڵێسەی تێبەردانو هوروژمی لافاوەکەشی ئاڕاستەیەکی درووستی گرتەبەر، بۆیە شوانی ووشتر بوو بە شوانی چەندان ئوممەتو بوو بە خەلیفەیەك کە حوکمی جیهانی دەکرد، سوارچاکی تەنها قەبیلەو هۆزو شارێك بوو بەوەی چەندین دەوڵەت بێنێتە زەلزەلەو فەتحی چەندین گەلو نیشتمانو شارستانی بەهێزو گەورە بکات.

ئەو کلیلە لەنێو ئەو قوتابخانە قوفڵکراوانەدا دانرا کەدەمێك بوو مامۆستاکان وازیان لێهێنابوو قوتابیەکانیش خەڵوەتیان تێدا دەکرد، بەڕادەیەك نە زانستو نە مامۆستاش هیچ بایەخێکیان نەمابوو، بەڵام ئەو هاتو باسی شەرەفو فەزڵو گەورەیی زانستو مامۆستای بۆ کردن، بەراووردی ئایینی لەتەك زانستدا کرد تا وایان لێهات بوون بەدەوڵەتو نەفەقو دەروازە، هەموو مزگەوتو تێکرای ماڵی موسوڵمانانیش بوون بە قوتابخانە، هاوکات هەموو موسوڵمانێك خۆی فێردەکردو خەڵکانی تریشی پێدەگایاند، ئەوەش بووە بەهۆی گەورەترین پاڵنەر بۆ گەران بە شوێن زانستو ئاییندا یان عەقڵو ئاییندا، چونکە تا عەقڵ نەبێت ئێمە ناتوانین ئایین بەدی بکەینو

بیدۆزینەوە، ئەوە کاری عەقڵە کە جستوجۆو گەڕان دەکات بەشوێن ئاینی ڕاستەقینەدا نەك دین، وە هەرکات دینمان بەدی کرد وەك بەرەبەیانی لێدێ، ئیدی بەهیچ جۆرێ پێویستیمان بە چرای شەو نابێت و بەگوێرەی ئەو خۆرە پڕشنگدارە دەڕۆین و ڕێدەکەین.

لەنێو دادگا داخراوەکاندا دانراو بەهۆیەوە هەموو زانایەك بوو بە دادوەرێکی دادپەروەر، موسوڵمانانیش بوون بە چەشنی ئەوانەی کە لەسەر زەویدا حوکمی خودا بەدادپەروەرانەترین شێوە بەڕێوە دەبەن، بۆیە باوەڕ بەخوداو ڕۆژی دوایی دۆزرایەوە، دادپەروەری زۆر بوو گەنگەشەو چەناکەدان کەمبووەوەو هاوکات شایەتی خراپەو حوکمی ستەمکاریش ونبوو و شوێنەواری نەما.

ئەو کلیلە لە نێو ئەو خێزانە داخراوانەدا دانرا؛ کە وای لێهاتبوو دایك و باوك لەبەرامبەر منداڵەکانی و، برا لەتەك براکانی و، پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا بەسووك تەماشای یەکتری بکەن، ئەو ڕەوشتە ناهەموارە هەر بەخێزانەوە نەوەستا بەڵکو تەجاوەزی کرد بۆ ناو کۆمەڵگە، کۆمەڵگەو خەڵکیش پێیەوە گیرۆدە بوون و، ئالوودەبوون بەقسەی ناشیرین و سووك تەماشکردنی ئەوانی دیکە، بەڕادەیەك ئەو ئیتیك و خووە لە نێوان گەورەو خزمەتگوزارەکەی، سەرۆك و ژێردەستەکانی، گەورەو بچوکدا، بوونی هەبوو؛ چونکە تێکرایان ئامادە بوون هەموو شتێك وەربگرن بەڵام لەبەرامبەردا مافی زەوتکراوی ئەوانی دیکە نەدەن، بۆیە بوون بەکەسانی موتەففیف و کەمفرۆش، ئەوانەی کە بەکێشانەو پێوانەو بێزیادو کەم شتەکانیان بە مەردوم دەفرۆشن، بەڵام

هەرکات هاتە سەرەی خۆیان مافی خۆی بەبەرامبەرەکەیان نادەن‌و شتەکانی خۆیان بەسووك بۆ دەکێشن‌و خیانەت لە مامەڵەکانیاندا دەکەن، بۆیە لە نێو خێزاندا باوەڕی چاندو لەسزای بەئێشی خودای مەزن ئاگاداری کردنەوەو ئەم چەند ئایەتەی بەسەردا خوێندن ﴿ **یاأیّها الناسُ اتّقوا ربّکم الّذي خَلَقَکُمْ مِنْ نَفْس واحِدة ...**﴾ (النساء:١) واتە: "**ئەی خەڵکینە! لە پەروەرندەکەی خۆتان ترستان هەبێ؛ کە هەر ئەوە ئێوەی لەیەك کەس خستۆتەوەو جووتەکەشی هەر لەو کەسە خستۆتەوە –ئادەم– لەو دوانەشەوە پیاوی زۆرو ژنی زۆری وەدی هێناوە. لەو خودایە بترسن، کە بەناوی ئەو ئێوە یەکتری سوێند دەدەن؛ ئاگاو لەخزمانیش هەبێ چونکە خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە**[٤٨]".

هەروەها بەگشتی بەرپرسیارێتی بەسەر خێزان‌و کۆمەڵگەدا دابەشکردو فەرمووی: " **تیکڕاتان سەرپەرشتیارن‌و، هەمووشتان بەرپرسیارن لەهەمبەر ئەوانەی کە چاودێریان دەکەن**[٤٩]".

ئا بەم چەشنە خێزانێکی دادپەروەرو خۆشەویست‌و راست‌و رەوان‌و، کۆمەڵگەیەکی عادیلی هێنایە بوون، هەروەها لەنێو ئەندامەکانیدا هەستێکی قووڵ بەئەمانەت‌و ترسێکی بێهاوتا لە دوارۆژی فەراهەمهێنا، تا گەورەو کاربەدەستەکان بوون بەکەسانی

[٤٨] - تێکرای وەرگێڕدراوی ئایەتەکان لە قورئانە وەرگێڕدراوەکەی مامۆستا هەژارەوە وەرگیراوە. *غوڵامی*

[٤٩] - صەحیحە.

لەخواترس‌و واریع‌و زۆرێکیان موسعەب ئاسا خۆیان لەخواردن‌و خواردنەوەش دەگرتەوە –مەگەر ئەوەندە نەبێ کە پێی بژین–، بەرادەیەك وایان لێهات گەورەی هۆزو قەومەکان بوون بە خزمەتکارو، والی ئومەتیش بەچەشنی وەلی هەتیوی لێهات، گەر پێویستی پێی نەبوایە دەیبەخشی‌و، گەر نەداریش بووایە ئەوا بەگوێرەی بەرەی خۆی پێی رادەکێشا.

بەهەمان شێوە ئەو کلیلە دەوڵەمەندان‌و سەرمایەداران‌و بازرگانەکانی کردە زاهیدو خواناس‌و خوودناس، بەرادەیەك وای لێکردن کە ئاخیرەتیان بەلاوە خۆشتر بێ تا دونیا، تێکرای ئەو سەروەت‌و سامانەشی کە هەیانە هەمووی بەموڵکی خودا بزانن‌و هەر بۆ لای ئەوی بگەڕێنەوە، ئەم ئایەتەی خوێند بەسەریاندا ﴿ **وانفقوا مّما جعلكَم مستخلفين فيه**﴾ ( **الحديد:٧**) واتە: "**لەو ماڵەی بۆی هێشتوونەتەوە لەرای خودا بەختی بکەن** " **هەروەها** ﴿ **وءاتوهم من مال الله الذي ءاتاكم**﴾ ( **النور:٣٣**) واتە:" **ببەخشن لەو ماڵەی خودا بەئێوەی بەخشیوە**".

هەروەها ئاگاداری کردوون لە هەڵگرتن‌و لە (إكتناز) شاردنەوەی سەروەت‌و سامانەکانیان‌و نەبەخشینی لەپێناوی خواداو، ئەم ئایەتەشی بەسەردا خوێندنەوە: ﴿**والّذين يَكْنِزونَ الذّهبَ والفّضةَ ولا يُنْفقونَها في سبيل الله** ... ﴾ (**التوبة: ٣٤–٣٥**) واتە: " **ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوەو لەرای خودا بەختی ناکەن، ئەی موحەممەد** (د.خ) **تۆ لەو ئازارە بە ژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە. رۆژێ ئەم زێڕو زیوە**

**بەئاگری جەهەندەم سوور دەکرێنەوە، تەوێڵو کەلەکەو پشتیانی پێ داغدەکرێ: ئە ئەردی ئەو شتە بچێژن کە بۆخۆتان هەڵتاندەگرتو کۆتان دەکردەوە".**

پێغەمبەری خودا (د.خ) بە پەیامو بەنگەوازەکەی ئەو تاکو فەردە چاکسازەی لەبەر چاو گرت؛ کە بروای بەخودا هەیەو، لە سزای دەترسیێو، ملکەچو ئەمینەو، دونیا دەکات بەقوربانی ئاخیرەتو، بە باوەرە بەرزو رۆحە بەهێزەکەی ماددە دەبێت بەشتێکی بێبەها لایو، باوەڕی وایە کە دونیا بۆ ئەو دروستکراوەو ئەویش بۆ دوارۆژ، کەوابوو هەرکاتو ساتو زەمانێ ئەم تاکە بوو بەبازرگان، ئەوا بازرگانێکی راستگۆو ئەمین دەبیێو، هەرکات کەسێکی هەژار بوو، ئەوا پیاوێکی شەریفی زەحمەتکێشی لێدەردەچیێو، گەر بوو بە کرێکاریش، ئەوا کرێکارێکی پرکۆششو مۆچیاریکەر دەبیێو، گەر دەوڵەمەندیش بوو، ئەوا کەسێکی سەخاوەتمەندو دەستگیرو خەمرەوێن دەبیێو، هەرکات بوو بە بە قازیو دادوەر، قازییەکی دادپەروەری تێگەشتوو دەبێت، هاوکات گەر بووبە والی، ئەوا والییەکی دڵسۆزو دەستپاك دەبیێو، هەرکات بوو بە گەورەو سەرکردە، ئەوا سەرکردەیەکی خۆبەکەمزانو بەسۆز دەبیێو، هەرسات بوو بە خزمەتگوزارو کرێنشین، ئەوا پیاوێکی بەهێزو ئەمیندار دەبیێو، دواجار گەر بووبە ئەمیندار بەسەر موڵکی گشتییەوە، ئەوا یوسف ئاسا پاسەوانێکی پارێزەرو زاناو دانای لێدەردەچێت.

لەسەر ئەم خشتانە کۆمەڵگەی ئیسلام کەوتەسەر پێ و حکومەتی ئیسلامی بونیادنراو رۆڵی خۆی بینی، بەدڵنیاییەوە کۆمەڵگەو حکومەتیش تەنها بالآنوارێکی (المرآة) مەزنی ئەخلاق و دەروونی تاکەکانن، گەر بەم چەشنە ئەم حکومەتە کەوتە سەر رێچکەی راستەقینەی خۆی ئەوا کۆمەڵگەیەکی چاکسازو ئەمینداریکی وەها دێتە بوون کە فەزڵی ئاخیرەت دەدا بەسەر دونیاداو، بەهیچ کلۆجێ بەها بۆ ماددەی پوچ و بێمایە دانانێ، بەئەندازەیەك کۆمەڵگە وای لێدێت؛ کە کۆی راستگۆیی بازرگان و دەستپاکییەکەی و، داوێنپاکی و زەحمەتی هەژارو، هەوڵ و تەقەلای کرێکاری مۆچیاریکارو، سەخاوەت و دڵدانەوەی دەوڵەمەندو، دادپەروەریی و حوکمی قازی و، دڵسۆزی و ئەمانەتی والی و، خۆبەکەمزانین و بەسۆزی سەرکردەو، هێزی خزمەتگوزارو چاودێری پاسەوانی بەئەمەك لەسەر موڵك و ماڵی دەوڵەتی، بۆ دەگوازرێتەوە.

ئەو حکومەتەش حکومەتێکی هەستیارو خەبەردار دەبێ و، بنەماکانی دەخاتە پێش قازانجەکانی و، رێنومایی لەپێش باجکۆکردنەوەو (جبایة) دادەنێت، دواجار بەکاریگەری وەها کۆمەڵگەو دەسەڵاتی حکومەتێك ژیانێکی گشتی دێتە ئاراوە، کە تێکرای لە باوەڕو، کاری چاك و، راستگۆیی و دڵسۆزیی و، هەوڵ و کۆشش و، دادی (عدل) لە وەرگرتن و بەخشینداو هاوکات دادپەروەریی لەتەك خوودی مرۆڤ و ئەوانی دیکەدا خۆی دەبینێتەوە.

لەراستیدا سەرم لە گفتوگۆکردن لەگەڵ دەروونمدا سوڕدەما، ئەو ژیانو ژیارە ئیسلامەم بە تێکرای جوانیو ناوازەییەوە هاتە بەرچاو و لە کەشوهەواکەیدا هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو، پەیوەندیم لەتەك خۆمو ئەم جیهانو سەردەمەدا پچڕاندو. تاسەی ئەو دەمەم دەکرد کە خەڵکی بە چ زەوقو شەوقێکەوە ژینیان گوزەر کردووە.

کاتی ئەوە هات لایەك بەلای ئەم چەرخەدا بکەمەوە، کە پاتەو پاتو بێمەرایی تێکرا ژینی تێدا دەگوزەرێنین، ووتم: " ئەمێستا چەندین قوفڵی نوێ بەدەرگای ژیانی مرۆڤایەتییەوە بەدی دەکەم، لەکاتێکدا ژیان مەودای چەندین قۆناغی درێژی بڕیوەو، چەندان هەنگاوی دوورو درێژی ناوە، کەچی تا بێت ژیان ئاڵۆزتر دەبێو دەچەمێتەوەو، مەسەلەکان پێشدەکەونو جۆربەجۆردەبن، کۆی ئەو مەسەلە جۆراوجۆرانە دەکەونە پرسیارو دەڵێن: ئایا دەکرێ وەها کلیلێکی کۆنو دێرین (العتيق) ئەم دەرگا نوێیانە بکاتەوە؟؟ شەووم خستە سەر ڕۆژ بۆ ئەوەی یەك بەیەکی ئەو قوفڵانە تاقیکەمەوە، تا ئەوەی بتوانم بڕیارێك بدەم.

بەسەری پەنجە دەستم دا لەو قوفڵانە، کەچی تێگەشتم کە ئەوانە چەند قوفڵێکی دێرینن بەڵام ڕەنگێکی نوێیان بەبەرداکراوەو، کێشەو گیروگرفتو کۆژانەکان (المعاناة) هەمان ئەو کێشانەی جارانن، زانیم کە گرفتە گەورەکەو بنەمای قەیرانەکە تەنها ئەو تاکەیە کە ئەمێستاش خشتی کۆمەڵگاو بناغەی حکومەتە.

**بینیم ئەو تاکە ئەمرۆ وای لێهاتووە تەنها بڕوای بەماددەو هێز هەیەو، بڕوای بە بایەخدان بەخۆیو ئارەزووەکانی نەبێ بڕوای بەهیچ نییە، سەرباری ئەوەش زۆر زیادەڕەوی لە ڕێزگرتنی لەرادەبەدەری ئەو ژیانەو، پەرستنی خوودو رازیکردنی هەواو ئارەزوەکانیدا دەکات، بەرادەیەك کە پەیوەندی لەنێوان خوداو پەیامی پێغەمبەرانو باوەڕی بە دواڕۆژ پچڕاندووە". ئیدی بیری نە لەلای مردنەو نە لەلای قیامەت، چەندە جوانی فەرمووە مەحوی:**

**سبەی، خاکت بەسەر، وەك من دەبێ ((تحت الثری)) بێ جێت**

**بڵا ئەمڕۆ کە خەوتی مەسنەدت تەختی سورەییا بێ[50]**

دواجار ئەو تاکە دەبێتە سەرچاوەی نەهامەتی پێشکەوتنو مەدەنییەت، هەرکات بوو بە بازرگان ئەوا بازرگانێکی قۆرخکارو مۆنۆپۆڵو تێرنەخواردووی (النهم) لێدەردەچێتو قۆرخکارییەکەی دەبێتە هۆی نانەوەی برسێتیو قەیران، وە هەرکات بوو بە کەسێکی هەژار ئەوا نەدارێکی هەڵپەکارو هەڵچووی لێدەردەچێت، کە دەیەوێ بەبێ ماندووبوون کۆششو هەوڵی ئەوانی تر بۆ خۆی قەتیسبکات، هەرساتێ کرێکار بوو ئەوا کرێکارێکی کەمبەزیاد فرۆشو (المطفف) لەسەر حسابی ئەوانی دیکە دەبێو، وە هەرکات دەوڵەمەند بوو، ئەوا دەوڵەمەندو سەرمایەدارێکی چڕوكو دڵرەقو هیچ لەبارا نەبووی

---

[50]- واتە: هەرچەند ئەوەندە کە ساغیت پایەت ئەوەندەش بەرز بێو پاڵ بە ئەستێرەی سورەییاوە بدەی، سبەینێ دەبێ وەك من بمری و بچیتە ژێر گڵ.

لێدەردەچێت کە نە تروسکاییەك بەزەیی‌و نە سۆزی تێدا بەرامبەر ئەوانی دیکە[51] بەدی ناکرێت، هاوکات کاتێ بوو بە والیش، ئەوا والییەکی غەشبازو دزو فزیکەری سامانی خەڵکی دەبێ، وە هەرکات گەورەو سەروەر بوو، ئەوا پیاوێکی چەوسێنەرو بێبەزەیی‌و هەڵچوو دەبێت، کە چاوی بە سوودی قازانج‌و خۆشگوزەرانی خۆیدا نەبێت بەهیچ شتێکی تردا هەڵنایە، وەگەر خزمەتگوزاریش بوو ئەوا کەسێکی لاوازو خیانەتکار دەبێت، وەگەر بوو بە پاسەوان، ئەوا پاسەوانێکی دزی لێدەردەچێت، وە هەرکات بوو بە وەزیری دەوڵەتێك یان سەرۆك وەزیرێك یان سەرۆك کۆمارێ، ئەوا کەسێکی وەها ماددی دەبێت کە خزمەتی خۆی‌و تاقمەکەی نەبێت هیچ کەسی دیکە ناناسێت، وەگەر بوو بە زەعیم‌و سەرکردە، ئەوا دەبێت بە کەسێکی نیشتمانپەروەرو نەتەوەپەرست کە نیشتمانەکەی تەقدیس دەکاو ڕەگەزەکەی دەپەرستێ‌و کەرامەتی وڵات‌و گەلانی دیکە دەنێتە ژێر پێیەوە، وە هەرکات بوو بە یاسادانەر ئەوا دەبێتە موشرعی یاساو ستەمکارو باجە کارەساتبارەکان، وەگەر بوو بەکەسێکی داهێنەر، ئەوا ئەو ئامێرانە درووست دەکات کە تێك‌وپێکدەرو تۆقێنەرو تەقێنەرەوەن‌و بەبێ بنەما مرۆڤی بێتاوان‌و خەڵکی لەنێودەبەن، وە هەرکات بوو بە دۆزەرەوە (مکتشف)، ئەوا ئەو گازە ژەهراوییانە دەدۆزێتەوەو ئیکتیشاف دەکات؛ کە وێرانکەرو تێکدەری گەل‌و نیشتمان‌و وەتەنی مۆڤایەتییە، وەك

---

[51] - فەلسەفەی ( ئەوانی تر، یان ئەوانی دیکە) کە بەرامبەر ووشە عەرەبییەکەیەتی (الآخر) لە ئیسلامدا زۆر بایەخی پێدەدرێ، تەنانەت چەندین پەرتووك‌و کتێبی لە ژمارە نەهاتووی دەربارە نووسراوە. غولامی

بۆمبی ناووکی (النووی)، کە ووشك‌و تەڕ لەنێو دەباو تاروماریان دەکات، وەهەرسات‌و وەختێ دارای هێزی جێبەجێکردن‌و دەسەڵات بوو، ئەوا گەر تێکڕای ئەو بۆمب‌و چەکە کۆکوژانە بەرداتەوە بەسەر هەر گەل‌و نیشتمانێکدا بەهیچ کلۆجێ باکی نییەو هەر بەهای چوونە خەیاڵیشی نییە لەلای، چونکە وا گۆشکراوەو جۆشدراوە.

دواجار بەم تاکانە کۆمەڵگە بونیاد دەنرێ‌و حکومەت درووست دەبێت‌و، دەبێتە کۆمەڵگەیەکی ماددیی واها؛ کە تیایدا قۆرخکاری بازرگان‌و، هەڵچوونی هەژارو، کەمبەزۆرفرشتنی (التطفیف)کرێکارو، چرووکی دەوڵەمەندو، غەل‌و غەشی والی‌و، چەوساندنەوەی گەورەو، خیانەتی خزمەتگوزارو، دزی پاسەوان‌و، قازانجی وەزیرەکان‌و، وەتەنییەتی زەعیمەکان‌و، بێدادی (إجحاف) یاسادانەرو، زیادەرەوی داهێنەرو دۆزەرەوەو، دڵرەقی جێبەجێکەر، کۆدەبێتەوە.

ئەم قەیرانە نوێ‌و گرفتە ئاڵۆزانە، زادەی ئەو دەروونە ماددیانەن؛ کە مرۆڤایەتی گلەو گازندەو دڵمەندییان لەدەست دەکات، ئەو قەرانانەش خۆی لە بازاری رەش‌و، بڵاو بوونەوەی بەرتیل‌و گرانی ناقۆڵاو، شاردنەوەی چەندان شت‌ومەك‌و، هەڵاووسانی دراو پارە دبینێتەوە.

بەرادەیەك بیریاران‌و یاسادانەران وایان لێهاتووە ناتوانن بەئاسانی چارەسەرێك بۆ کۆی ئەم گیرو گرفت‌و کۆژانانە بدۆزنەوە، هەرکاتێکیش لە قەیرانێك دەربازدەبن دووچارو تووشیاری قەیرانێکی

دی دەبنەوە، بەڵکو ئەوە ئەو چارەسەرە کاتی و کوورتخایەنەی ئەوانە بووەتە هۆی درووست بوون و کەڵەکە بوونی چەندین قەیرانی نوێ و، لە حکومەتێکی کەسییەوە دەچنە نێو حکومەتێکی دیموکراتی و، لە دیموکراتیشەوە بۆ دیکتاتۆری و میکیاڤێللی، هاوکات لە سیستەمی سەرمایەدارییەوە دەیگوازنەوە بۆ سیستەمە ئیشتیراکی و لەوێشەوە بۆ شیوعی، کەچی بارودۆخەکە هیچ گۆرانێکی بەسەردا نایە؛ چونکە تاك ئەو بناماو سەرچاوەیەیە کە نەگۆراوەو پێویستی بەگۆرانکاری هەیە، بەڵام لە تێکرای هەموو ئەمانەدا نازانن یان لەبیری خۆیانی دەبەنەوەو خۆیانی لێ گێلدەکەن، کە هۆکارەکەی تاکە گەندەڵ و لارو وێرەکەیە، وە گەر بیانزانیبایە کە ئەوە (تاك)ە هەم بنەمایەو هەمیش گەندەڵ و لارو خێچە، ئەوا هەر نەیاندەتوانی چاکی کەنەوەو گۆرانکاری تێدا ئەنجامبدەن؛ لەبەر ئەوەی – سەرباری هەبوونی زۆرێك دامەزراوەی زانستی و رۆڵی پەروەردەو فێرکردن– بەڵام ئەو میکانیزمەیان نییە کە لەرێیەوە بتوانن ئیسلاح لە تاکدا بکەن و خوارو خێچییەکەی رێك بکەنەوەو، ئاراستەکەی لە شەرەوە بۆ خێرو لە رووخانەوە بۆ بونیاد بگۆڕن، چونکە ئەوان لەرووی رۆحەوە مایە پوچن و دووریشیان لە باوەڕ گرتووە، هاوکات تێکرای ئەو ئالەتانەیان وون کردووە؛ کە دڵ دەبوژێنێتەوەو، باوەڕ دەچێنێ و، پەیوەندی نێوان بەندەو خواداو، ئەم ژیانە بەئاخیرەتەوەو، ماددە بەرۆحەوەو، زانست بە ئەخلاقەوە، سەر لەنوێ دەگەڕێنێتەوە.

لە کۆتاییدا مایەپووچی رۆح و ماددە کوێرانەکەیان و خۆبەگەورەزانینیان دەبێتە هۆی بەکارهێنانی ئەوپەڕی ئەو ئامێرە وێرانکەرانەی، کەبەیەک جار گەلێکت بۆ وێران دەکاو، نیشتمانێکت بۆ پێکەوەکاندەداو، ژیارو شارستانییەکت بۆ هەپروون هەپروون دەکا، ئەمە گەر بێت و هەموو ئەو دەوڵەتە جەنگاوەرانەی کە ئەم چەک و ئامێرانە بەکاردێنن بکەونە وێزەی یەکتر، کە وەک باسمان کرد دواجار کۆتاییەکی پڕ ئازاری لێدەکەوێتەوە.



## لە دایکبوونی ساڵێکی نوێ[٥٢]

گەر بپرسین ئەوە کام رۆژە لەمێژوویی مرۆڤایەتیدا شایستەی ئەوەیە لەلایەن مرۆڤەکانەوە ئەوپەڕی ڕێزو شکۆی لێبنرێ‌و، شیاوی ئەوەیە کە هەرگیز لەیاد نەکرێ‌و بەڕۆژێکی نەمرو هێڵێکی یەکلاکەرەوەی خولگەی مێژووی مرۆڤایەتی هەژماربکرێ؟.

گەر بپرسین کام ڕۆژەیە کە تێکڕای مرۆڤایەتی سەرباری جیاوازی چینایەتی‌و گەل‌و نەتەوەو ڕەگەزو فەلسەفەیان بەدەربڕینی

---

[٥٢]- وێستگەی (دەلهی) لە هیند بەبۆنەی مانگی بەهاری یەکەمەوە (ربیع الأول) بڵاوکردەوە. دانەر

خۆشیو شادیو ئاهەنگێڕان، بەشداربوون لەڕێزلێنانیدا، لەبەر ئەوەی تێکرای مرۆڤەکان هەر لەو ڕۆژەدا بوو دوای نارەحەتیو شەکەتیەکی تاقەت پرووکێن، پشوویانداو خۆشی خۆیان دەربڕیو، پاش ئەو هەڵنووتانەی کەچەندین سەدەی برد جارێکی دی ڕاپەڕینەوە؟.

گەر بپرسین کام ڕۆژەیە کە بە لەدایکبوونی جیهانێکی نوێو، سەرەتای سەردەمێکی کامەرانو، ڕەمزی سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەداو، هێزی خێر بەسەر هێزی شەڕداو، دادپەروەرییو یەکسانیو، سۆزو بەزەییو دڵدانەوە، بەسەر خراپەو دڵرەقیودڕندەییدا، دادەنرێت، ئەمە سەرباری سەرکەوتنی ژیانێکی ڕێکخراو و شەریعەتێکی تەواو بەسەر یاسای دارستانو خووی چەتەکاندا، بەکوورتی سەرکەوتنێکی نەمریی زانستو باوەڕ بەسەر نەزانیدا بەهەموو واتاکانییەوە؟.

گەر بپرسین ئەوە کام ڕۆژەیە کە تێیدا هێزی نوێو چالاك بۆ قەڵاچۆکردنی شەڕو ڕێگرتن لە تەوژمی گەندەڵی بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ کە لەسەر پێی باوەڕو کاری چاکەو لەخواترسانو خزمەتکردنی مرۆڤایەتی وەستابێ، لەدایك بوو، کۆمەڵگەیەك کە لە باشترین پیاوانێ پێکهاتبێ، بەچەشنی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەپەسنی هاوەڵاندا دەفەرموویت:" **کەمترین تێچووی ژیانی ڕۆژانەیان هەبووەو، دارای باشترین دڵو، زانستی لەڕادەبەدەر بوون**". ئەوانە کۆمەڵە کەسانێ بوون سەربای ئەوەی بەهیچ کلۆجێ ژیانی دونیایان بەخۆشی نەبردۆتەسەرو کامەرانی دونیایان وەچنگ نەکەوتووە، بەڵام

لەپێناوی خۆشبەختی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و، دەربازکردنی لەتاریکایی چەرخە کۆنەکان بۆ ڕووناکی سەدەی نوێ و، لەپەرستنی خەڵکییەوە بۆ پەرستشی خودای تاك و تەنهاو، لەناڕەحەتی و تەنگەبەری دونیاوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی بەرفراوانی دوارۆژ، گیانیان بەخت کردو ژیانیان کردە قوربانی کۆمەڵگەو تێکڕای ناهەمواری و دۆڕان و کودەتایەکیان لەئەستۆ گرت، ئەمە بەبێ ئەوەی ناکۆکی و دوژمنکاری بکەوێتە نێوانیانەوە، بەڵکو درووست بەپێچەوانەوە خۆشەویستی و ڕاستگۆییان بۆ یەکتری پتر دەبوو، وەك خودا دەفەرمووێت: **﴿أذلة على المؤمنين أعزة على الكافرين...﴾ (المائدة:٥٤)** واتە:" **لەحاسی باوەڕداران نەرم و نیان دەبزوونەوەو، لەهەمبەر دین دوژمنان سەربڵندن، لەڕێگەی خوادا دەجەنگن و لەتەشەری سەرکۆنەکەران ناترسن**". ؟.

گەر بپرسین ئەوە کام ڕۆژە کە گەلانی سەر زەمین هاتنە دونیای منداڵێکی تازەیان بەخۆوە بینی؟، بەڵکو منداڵێك کە بۆ یەکەمین جار لەسەر شانۆی مێژوو وەدەرکەوت، سەرباری ئەوەی لەپێش ئەودا چەندان هۆزو قەبیلەی پەرتەوازەو، چەتەی دڕو، کەسانێ کە لەسەر سیادە دەجەنگین، ژیاوون، هاوکات لەپێشدا گەلێك لەسەر بەرەی ئوممەتانی دیکەو، کەنارگیر لە جیهان ژیاوەو، هیچ باکی بە چارەنووسی ئوممەتان و، سیاسەتی دەوڵەتان و پرۆگرامی ژیان و، ئەخلاقی کۆمەڵگەو، ئاڕاستەو مەیلی مرۆڤایەتی نەداوە، جگە لەو شیعرانە نەبێت کە لەمەڕ ڕووداوە نێوخۆییەکان و غەرەزە بێبەهاکان

نوسیویەتی، کە پیتۆڵی زمانەوانی خۆیو، ئازادی تاکو، هێزی دەربڕینو فراوانی زمانەوانی خۆی تێدا دەرخستووە، کە گشت ئەمانە هیچ پشکێکی لەپەرتووکخانەی جیهاندا نەبووە، هاوکات گەڵێ کە تێکڕای ئەو شیعرانەی بە دیواری کەعبەدا هەڵدەواسرا دەخوێندەوەو تەنهاش لە بیاباندا بڵاودەبوویەوە، هەر لەناو ئەو بادییەشدا ئەوپەری ڕێزو شکۆی لێدەنرا، ئیدی بەبێ ئەوەی ڕوناکبیرو ڕۆشنبیرانی دەرەوەی نیمچەدوورگەی عەرەبی ئاگاداری بن یان بیخوێنەوە، یاخود بۆ چەندین زمانی جیهانی پێشکەوتوو بگوازرێتەوە، ئیدی ئەم گەلە بە ڕاستگۆیی زمانیو هێزی ڕووخساریيو باشی ئەندێشەیو حەزکردن لە ئازادیو یەکسانیو سادەییو کەنارگیری لەژیانو، جوامێرییو خۆڕاگری لەجەنگداو، پارێزگاریی لە نەژادو ڕەچەڵەك ناسراو بوو، ڕاستر وایە بڵێین باشترین ئاکارو ئەخلاقو بەهرەیەك کە گەلێکی بیابان لەوانی تری جیا بکردایەتەوە ئەم گەلە بوون، ئیدی ئەم شەعبەی سەری کردبوو بەنێو کۆشیاو خۆی چەماندبووەوەو لە بن بەردی ئەو نیمچە دوورگەی عەرەبییەدا خۆی مەڵاس دابوو، پاش لەدایکبوونی ئەو منداڵە دەبێت بە ئوممەتێك کە مافی چارەی گەلانی دیکە دیاری دەکاو، ڕووگەو ئاراستەی جیهان بەیەك جاریی دەگۆڕیۆ، ئەو مەدەنییەتەی لەئایینی تازەوە وەریگرتووە کە دارای ڕۆحی لەخواترسانو ئەمانەتە، بیسەپێنێ بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیداو، ئەو زمانەی کەلە نیمچەدوورگە عەرەبییەکەدا قەتیسکرا بوو بیکات بەزمانێکی جیهانی پیرۆز؛ کە هەرچی گەورە زانایانو زمانەوانانی جیهان هەیە هەوڵی دیراسەکردنو فێربوونی بدەنو، لەژێر ڕۆشنایی زانستو ئادابەکەی

چەشکە ببەن‌و هونەرسازی تێدا ئەنجام بدەن، تەنانەت زانین‌و فێربوونیشی ئەرکێك بێت لەئەرکەکانی دین‌و دروشمێك بێ لە دروشمەکانی ئایینداران، بەڕادەیەك بەبێ ئەو دروشمە هیچ کەس نەگات بە چڵەپۆپەی‌و بەهیچ کلۆجێکیش پۆست‌و پلەی قەزاوەت‌و فەتواو فێرکردنی پێنەدرێت.

گەر بپرسین ئەوە کەی ڕۆژەیە کە جارێکی دی هومێد کراوە بەبەری مرۆڤایەتی‌و داهاتوویدا، گەشبینی زاڵ بوو بەسەر ئەو ڕەشبینییەی کە لەسەر نەهامەتی‌و گاڵتەجاری بونیادنرابوو، کە مرۆڤ لەهەموو پارچەیەکی ئەم زەوییەو لەنێو ئوممەتێك لەئوممەتەکانیدا پیادەی دەکرد، ئەو ڕەشبینییەی کە بەند بوو لەسەر هەرزەگۆ (سخافة)کردنی مرۆڤ لە عەقڵ‌و باوەڕو کردارداو، هەوڵدانی بۆ ڕووخاندنی مەدەنییەت‌و پەرستنی مرۆڤایەتی، تا ئەو ڕادەیەی مرۆڤ لە داهاتووی بێهومێد ببێ‌و مافی مانەوەو شایستەیی ژیان بەخۆی ڕانەبینێ‌و خۆی بەشیاوی سزایەکی کوتوپڕو لەنێوچوونی جیلی مرۆڤایەتی بداتە لەقەڵەم؟.

بەڵام بە دەرکەوتنی گزنگی ئەم ڕۆژە، شیاوی ئەوەیە کە بواری زیاتر ببەخشێ بە ئەجەل‌و، ژیانی درێژە پێبداو، پشت بە بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ‌و، زیندوکردنەوەی وانەکانی فزیلەت‌و واتا بەرزەکانی ببەستێت، ئەوەش بە گێڕانەوەی ڕێزی مرۆڤ بۆ مرۆڤ‌و بە گرتنی دەستی ستەمکارو سەرخستنی ستەملێکراو و، بەو ژیانە نوێیەی کە شیاوی شەرەفیەتی‌و لەگەڵ بونیادی درووستبوونی‌و

ئامانجی ئەم گەردوونەدا یەکانگیر دەبێت، ئەو ڕۆژە بووبە درێژەپێدەری ژیانی مرۆڤو هەلێکی نوێ لەمانەوەو گەشەکردنی لەسەر ئەم ئەستێرەیە، کە تێکڕای ئەوانەی دوای ئەم ڕۆژە لەدایکبوونو دوابەدوای ئەو چەرخەی کە لەپاش ئەوەوە دێت، ژیاوون، دان بەم منەتە گەورەیەدا دەنێنو بەشانازییەکی مەزنی لەپەرتووکی ژیانیاندا لەقەڵەم دەدەن.

بەبێ هیچ گرێوگۆڵەو گێروگرفتو خوتخوتەو ڕاڕاییو دوودڵییەك وەڵامی ئەو پرسیارە، ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا گەورەترینو بەڕێزترینو بەشکۆترینی دروستکراویی خودای هاتە دونیاوە کە " **موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەللیبی کوڕیی هاشم** (د.خ) بوو".

ئەو ڕۆژەیە کە مرۆڤایەتی ئەو ئیمانەی دەستکەوتەوە کە ماوەتێکی دوورودرێژ بوو گمی کردبوو و مایەپووچ بوو. ئیمان بە خوڵقێنەری تاك و تەنهای ئەم گەردوونە، ئیمان بەچارەنووسی خۆیو بە زیندوبوونەوەی دوای مەرگ؛ کە دوای ئەوەی بەهۆی دواکەوتنی ئارەزواتی دونیا لێی ناهومێد ببوو، ئیمان بەزنجیرەی پەیامبەرانو ڕێنیشاندەران، ئەو ڕێگایەی کە دەمێکە دەجاله پیشەگەرەکان (المحترفون) دەستیان بەسەردا گرتووە، ئەوانەی بەناهەق ماڵو موڵکی خەڵکی دەخۆنو ڕێگەی خودا لەموسوڵمانان یاساغ دەکەن، ئیمان بەو بەهاو کەرامەتەی مرۆڤ کە زەمانێك بوو لەبەردەم دارو بەردو، گیاندارو بێگیانو ڕووبارو، پادشایانو مەلیکان، ئەمیرو بەهێزو سەرمایەداراندا، خۆی نەوی دەکردو بەهای مرۆڤی خۆی لەدەستدەداو سووکایەتییەکی

بێئەنازەی بەخۆی دەکرد، بەڕادەیەك ئەو ئیمانە وەهای لێکرد کە دونیا بۆ ئەو فەراهەمهێنراوەو ئەویش بۆ پەرستشی خودا درووست بووە، هاوکات هیچ جوداوازیی‌و فەزڵی عەرەبێك بەسەر غەیرە عەرەبێکداو بەپێچەوانەشەوە نییە، تەنها بە تەقواو لەخواترسان نەبێت، تێکرای بەنی ئادەمیش هەر لە ئادەمن‌و ئادەمیش لە خۆڵە.

بەڵێ ئەو مرۆڤە لەدوای ئەو ڕۆژەوە باوەڕی بە ماف‌و ئەرکەکانی هێنا، هەموو کەسێ مافی هەیەو ئەویش ئەرکی لەسەرە، با ئیدی لە بەدەستهێنانی مافی ئەوی دیکەدا خۆی بکا بەهاوەڵ‌و چەشکە لە لێسەندنەوەی مافیدا بباتو، ئازاو دلێرو بەجەرگ بێت لە ڕایکردنی ئەرکەکەیدا کە لە ((**کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیته**))ییدا خۆی دەبینێتەوە، هاوکات ئافرەتانیش خوشکی پیاوانن‌و بەچەشنی ئەوان مافیان بەسەر پیاوەنەوە هەیە، ئەم بەهایانەو چەندانی تریش لەو بەهاو ئاکارو ڕێنماییە حەکیم‌و ئەخلاقیانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) هێناویەتی‌و هەروەها کاری مرۆڤایەتی هاوسونگ دەکاتو پێیدەگەیەنێ‌و تێدەگەیەنێ..، کە هەر لەژێر سایەو فەزڵ‌و گەورەیی ئەودا بوو کە کۆمەڵگەیەك هاتە بوون وێنەی لە مێژوویی مرۆڤایەتیدا لەهەموو ئان‌و زەمانێکدا نییەو ناشبێتەوە.

هاتنی پێغەمبەر (د.خ) هاوکات بوو لەتەك هاتنی ئوممەتێکی نوێ، ئوممەتێك کە تەنها بۆ ئەم بانگەوازە پیرۆزو کۆششە بەرزە ژیاوە کە خودا لەبارەیانەوە دەفەرموویێت ﴿ کنتم خیرَ امّة اُخرجَتْ للنّاسِ ...﴾ (آل عمران: ١١٠) واتە: "ئێوە لەناو مەردوومی دونیادا چاکترین کۆمەڵن

**كە سەرتان هەڵدا؛ فەرمان بەچاكە دەدەن‌و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن، باوەڕیشتان بەخوا هەیە"ئوممەتێك كە خۆی بەو بانگەوازە بەخشیوەو ژیانی بەستۆتەوە بەژیانی ئەوەوە.**

ئەوەی سەرۆكاری ئەم ئوممەتە نوێ‌و نەمرەی -كە ئەم بانگەوازەی پێوە بەندە- دەكات، ئەو كۆمەڵەن كە بەڕاستگۆیی‌و دڵسۆزییەوە باوەڕیان بەخاوەنی ئەم پەیامە بەرزە هێناو، دەستیان خستە نێو دەستی پێغەمبەر (د.خ) و كردیان بەخاوەنی موڵك‌و ماڵ‌و سەروەت‌و سامانیان‌و، تێكڕای ویست‌و ئارەزواتیان ملكەچی فەرمانی ئەو كرد، هەر ئەوانە بوون بە سەربازو هاوەڵە سەرەتاییەكانی‌و، هاوكات بوون بەهەڵگری بەیداخ‌و بانگەوازەكەیی‌و، لە ڕووی زانست‌و تێگەشتن لە دەقەكانی قورئانی پیرۆزیشەوە، ئەوان پشكی شێریان بەركەوت‌و، لەپێناوی گەیاندنی ئەم پەیامە بەتەواوی مرۆڤایەتی چەندین قوربانی‌و نشێوی سەخت‌و نەهامەتی‌و كوێرەوەری‌و برسێتی شیوی ئەبو تالیبیان بینی، بەڕادەیەك هێندە پێغەمبەری ئازیز (د.خ) دڵی پێیان دەكرایەوەو دڵخۆش‌و كامەران بوو بەو كۆمەڵە هاوەڵە دلێرانە، كە خەمی بوو لە مەیدانی(جەنگی بەدر) تێكڕایان شەهید بن‌و فەرمووی (د.خ)" **خودایە گەر دوای ئەمڕۆ ئەم دلێرانە لەنێو بچن؛ ئەوا جارێكی دی لەسەر زەویدا كەسێ نامێنی كە تۆ بەتاك‌و تەنها، بپەرستی**"[٥٣].

---

[٥٣] - بۆ زانیاری پتر تەماشای (سیرة ابن هشام: غزوة بدر)، بكەن. دانەر

خودای گەورە ئەم کۆمەڵە عەرەبەی لەسەر زەوی جێگیر کردو، دوای زەلیلی سەربەرزی کردن، دوای نەداری دەوڵەمەندو بێ ئیحتیاجی کردن، پاش لاوازی بەهێزی کردن، دوای پەرتەوازەیی یەکی خستن‌و کردنی بە برا، هاوکات پیرۆزییەکی دینیشی بەو زمانە قەتیسەی نیمچەدورگەی عەرەبی بەخشی‌و، لەسەری نووسی کە دەبێت لە تێکرای جیهاندا بڵاوببێتەوە، خۆشەویستیشی لە دڵدا بەڕادەیەك چاند کە زۆرێك زمان لەبەردەمیدا بەیەکجاری سڕایەوەو بوو بە تەنها زمانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، دواتریش لەجیهانی ئیسلامی نوێدا بوو بە زمانی ئایین‌و زانست‌و نووسین، چەقێکی (مرکز) بەعەرەب بەخشی کە بۆ هەتاهەتایە لەگەڵیاندا بە نەمری دەمێنێتەوە، مادەم ئەوان باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام‌و ڕێنماییەکانی هێنابێ‌و، کار بە فەرزو واجبەکانی بکەن‌و، بەفەزڵ‌و منەتی پێغەمبەری خۆشەویستی (د.خ) بزانن‌و، باوەڕیان وابێت کە هەر ئەوە کەرامەت‌و ڕێزو تەقدیری بە مرۆڤ بەخشیوەو عەرەبیش پێی گەورەو شەرەفمەند بووە، ئەمە سەرباری بوونی بزاڤی نەتەوەپەرستی‌و نەتەوە توندڕۆکان لەجیهانی ئیسلامیدا.

ئەوە ئەو جیهانە نوێیەیە کە خەڵکی ژیانی تێدا گووزەر دەکەن‌و چەشکە لەیەکتر دەبەن‌و، کەڵك لە ئازادی‌و یەکسانی‌و زۆرێك لەو مافانەی کە دەمێکە لە جیهانی کۆندا سڕاوەو هەرسکراوە وەردەگرن، هەروەها مەدەنییەت‌و گەشەکردن تێیدا بەرەو پێشەوە دەڕوات، ئەوە ئەو جیهانەیە کە ئەمێستا عەرەب کەڵکی لێوەردەگرێ‌و تێیدا بە بوونی

چەق و بنکەیەکی نوێو، ژیانێکی تازەوە دەژین، هاوکات ئەو پەیوەندییەشی کە لەتەك چەندین وڵاتدا بەستوویانە تەنها لەڕێگەی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی (د.خ) و پەیامەکەی ئەوەوە نەبێت بەهیچ کلۆجێك نەیاندەتوانی ئەو پەیوەندییانە ببەستن.

لەڕاستیدا زۆر جار وا هەست ناکەین کە سەرچاوەی ئەو گۆڕانکاریی و خۆشبەختییەیی کە تێکڕامان چێژی لێوەردەگرین، بەهۆی بوونی ئەو ڕۆژەو لەدایکبوونی پێغەمبەری خۆشەویستەوە (د.خ) بوو بێت. بەڕاستی لەو ڕۆژەدا مافی هەموو گرۆی مرۆڤایەتییە کە بەو پەڕی شەرەف و شانازیی و ڕێزەوەو بە زمانێکی پاراو و ڕەوانبێژو شێرگیرەوە، هۆنراوەی ئەو شاعیرە بڵێنەوە کە لە پەسنی پێغەمبەری خۆشەویستدا (د.خ) فەرموویەتی:

ولد الهدى فالكائنات ضياء وفم الزمان تبسم وثناء[٥٤]



---

[٥٤] - واتە: ئەو دەمەی پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) کە هیدایەتدەرە هاتە دونیاوە، گەردوون بەیەکجار ڕووناکبوویەوەو، دەمی زەمان و کاتیش بەهاتنە دونیای ئەو زاتە موفەڕکە خەندەی دەکردو کەوتە پەسنی. *غوڵامی*

بە هەمان چەشن (د.سەباح بەرزنجی) ش هۆنراوەیەکی نووسیوە کە ئەمە پارچەیەکە لەو هۆنراوەیە:

من رام نظرته في محشر الأمم – فليرتقب حبه أغلى وغتنم.

أكرم بآمنة لمّا ولدت – بدراً يضيء سماءاً كامل القتم. *غوڵامی*

## لەنێو لانکەی ئیسلامدا[DD]

 وتم: جەنابت تازە لە حیجاز هاتوویتەوە؛ تۆزێ باسی ئەوێمان بۆ بکە، وتم: بەڵێ، قسەکردن دەربارەی خۆشەویستەکەت گەلێك خۆشە.

ئەو ڕۆژەم بیرنییە کە باس‌و خواسی مەککەو مەدینە لەگوێمدا تازەبووبێ، یەکەمین ڕۆژێ کە دەربارەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) و لانکەی ئیسلام‌و مەدینەکەی خۆی (د.خ) و هاوەڵە موهاجیرەکەی(ر.خ) بیستبێ، لەو ژینگەدا بوو کە منیش هەروەك منداڵی موسوڵمانان

DD - لەوێستگەی (دەلهی) ساڵی ١٩٥١ ز بڵاوکراوەتەوە. دانەر

هەردەم باسی حیجازو دوو شارە پیرۆزەکەی بووبووە وویردی سەر زوبانمان، بەڵێ بۆ یەکەمین جار لە هیندستان بوو لە هیندستان، ئە وڵاتەی کە هەمیشە لە قسەکانیاندا حەرفی عەتفی نێوان ( مكة و مدينة) نەپەڕێننو دەڵێن:" **مەککە مەدینە**". من لەدەمی منداڵیمدا هەموو کات ئەو دوو شارە سەر خەیاڵمدەکەوت، دەموت هەردووکیان یەك شارن، کەمجار نەبێ؛ ئەگینا هەرسات باسی مەککە کرا بێ نەبایە باسی مەدینەش بکرایە، یان بەپێچەوانەوە، واتە لەلای خەڵکی هیند وەك لازمەو مەلزوومی یەکتریان لێهاتبوو، تا ئەو کاتەی کە گەورە نەبوومو هێشتا لەهەرەتی منداڵیدا بوومو عەقڵم پێنەگەشتبوو لێکم جودا نەدەکردنەوە، لە دوای گەورەبوونم زانیم کە مەککەو مەدینە دووشاری جودانو مەودای نێوانیان هێندە دوورە کە گاڵتەی پێناکرێ.

هەمیشە لەتاوی منداڵیمدا گوێبیستی باسی بەهەشتو نیعمەتەکانی بەهەشت دەبووم، بە هەمان سۆزو شکۆو ڕێزەوە کە دەربارەی حیجازو هەردوو شارەکەی دەمبیست، بەرادەیەك بەسۆزی بەهەشتو حیجازو مەککەو مەدینەوە پێکەیشتمو گەشەم کرد، ئەو دەمەی گەورە بووم زانیم کە بەهەشت لەم ژیانەدا وەدەست نایە؛ بۆیە ئارامم گرتو پرسەم بۆ خۆم ساز کردو دڵی خۆمم دەدایەوە.

بەڵام وتیان دەتوانی بەئاسانی بگەیتە شاری حیجاز، لەم لاو لەولا دەمبیست کە کاروانی حاجیان دێنو دەڕۆن، ئیدی هیچ بیانوویەکم بە خۆم نەهێشتەوە بۆ ئەوەی لەتەکیاندا نەڕۆمو پێیان ڕا نەگەم، دواتر تەمەنم گەورەتر بوو تا بێت زیاترو زۆرترم دەربارەی

ژیانی پێغەمبەری ئازیزو (د.خ) مێژووی ئیسلام، دەخوێنەدەوەو موتالآم دەکرد، ئیدی هەمان سۆزو شەوق‌و نەزاکەتی جارانم بۆ درووست بوو، هەردەم بەدەم چەرخی چنگ بەخوێنی خۆمەوە دەمووت:" **ئاخۆ کەنگێ دەبێ رۆژێ من لەتەك قافڵەی حاجیاندا، لەتەك خۆری زیوینی دەم بەیاندا، لەتەك ئەو کۆترە بەئەدەبانەی کە ریقنەو پیسی ناکەن بەسەر مەرقەدی پێغەمبەری خۆشەویستدا، لەتەك جریوەی چۆلەکەی بێ هێلانەو، ئاسکی بێ لانەو، گریانی منداڵانی بەریئی بێ لانکەدا، بتوانم بچمە خزمەتی، بەڵێ توانیم خودا بۆی حاسڵ کردمو، شادبووم بە حەج‌و زیارەتی پێغەمبەر (د.خ)**".

چوومە ئەو شارەی بە چەندین کێوی ڕەش و وشك‌و برینگ گەمارۆ درابوو، کە نە گژوگیاو نە سەوزایی نە ڕووبارێکت تێدا بەدی نەکرد، خاڵی لە تێکڕای ئەو شتانەی کە مرۆڤ لەدەروونیدا بایەخی پێدەدات‌و سنگی شەرح دەکات‌و دەروونی لە ئاشووبی دیمەنی‌و، لە جوانی سروشتی‌و، لە هەوای فێنکی‌و، لە پاراویی ئاوەکەی دڵخۆش دەکات، وتم: ئای ئەم شارە چەندە بێدیمەن‌و وێنەگایەو چەندەش فەزڵی بەسەر مرۆڤایەتی‌و جیهانی پێشکەوتووەوە هەیە! گەر ئەم شارەی دیمەنێکی جوانی دێدا بەرچاو ناکەوێت کە دڵی مرۆڤ پێی ئاو بخواتەوە، نەبایە؛ ئەوا جیهان وەك قەفەسێکی ئاڵتوونی لێدەهات کە مرۆڤ تێیدا چەشنی باڵندەیەکی بەندکراو دەبوو ، ئەوە ئەو شارەیە کە مرۆڤی لە تەنگەبەری دونیا دەرهێناو، جارێکی دی ئازادیی‌و کەرامەتی

بۆ مرۆڤایەتی گەڕاندەوەو، کۆت و بەندو زەنجیری لە دەست کردەوەو بۆ هەتاهەتایە ئازادی پێبەخشی و لەکۆیلایەتی رزگاری کرد.

ئەوەندەی وتم گەر ئەم شارە نەبایە، یەکسەری بەدڵمدا هات کە کۆی هەرچی پایتەخت و شارەگەورەکانی جیهانە بیانخەمە تای تەرازوویەکی دادپەروەرانەوە، سەیرم کرد تا بزانم چی لە مرۆڤایەتی و ژیارو شارستانی مرۆڤایەتی کەم دەکات گەر ئەم شارانە نەبن؛ یەك بەیەکی شارەکانم هێنایە بەرچاوم، تەماشا دەکەم هەریەك لەم شارانە دەگریت تێکڕایان بۆ خۆی یان بۆ گرۆهێکی کەمی بنیادەم ژیاوون و، شتێکی وا ناخەنە سەر کەڵەکە بەردی مرۆڤایەتی، لەزۆرێك لەو وڵات و ژیارانە بە هەموو ڕووەکانیەوە ووردبوومەوە، گەلێك شارو وڵات لەپێناوی هێنانەکایەی مرۆڤ بوون و مەدەنییەت نەدارو دەستەوەسان بوون، چەندین ئوممەت و نەتەوە دووچاری ناڕەحەتی بوونەوە لە پێناوی خۆشبەختی ئومەتێکاو ئومەتێکیش لەپێناوی تاکەکاندا دووچاری چەندین تەنگ و چەڵەمە هاتەوە، ئیدی نەدونیاو نە مرۆڤایەتی و نە ژیارو شارستانی نەیانتاوانی مەدەنییەت و ئاوەدانی بە هەموو واتاکانییەوە ببەخشنە مرۆڤ و ئینسان. بەڵام گەر مەککە نەبوایە، ئەوا کۆی مرۆڤایەتی لەجوانترین واتاو حەقیقەتەکان و، باوەڕو ئەخلاق و، زانست و فەزائیل بێبەش دەبوون. لێرەدا جیهان ئەو واتانەی وەدەستکەوتەوە کە چەندین سەدەی دوورودرێژە وونی کردووە، هاوکات ئەو زانستەی وەدەستکەوتەوە کە لەئەشکەوت و چاڵی نەزانی و گوماندا لەکیسی دابوو، ئەو کەرامەتەی دۆزییەوە کە چەتەو

ستەمکارەکان لێیان زەوت کردبوو، بەکوورتی جارێکی تر مرۆڤایەتی هاتە کایەوەو سەرلەنوێ مێژووی نووسییەوە.

بەڵام من چیم تا بڵێم گەر مەککە نەبوایە! ئایا ئەوە مەککە نییە؛ کە بەدرێژایی چەندین سەدەی دووروودرێژە، بە پێش سەدەی شەشەمی میلادی مەسیحیشەوەو، بە کێو و لەو تەنانەت خانوو و زەمزەمەکەشیەوە، ڕووبەرووی هیچ سەرگەردانییەکی مرۆڤایەتی نەبووەتەوەو، بۆ تەنها ڕۆژێکیش بەدرێژایی ئەو چەندین ساڵە دەستی یارمەتییان بۆ ئەو کەسانە درێژ نەکردووە، بەڕادەیەك خۆیان لەنێوان ئەو کێو و لەمەدا قەتیس کردووەو کەناریان لەتێکرای جیهان گرتووە، وەك ئەوەی لەخێزانی مرۆڤایەتی نەبن‌و، پارچەیەك نەبن لەم زەوییە پان‌و بەرینە؟ بەڵکو شیاوتر بوو بڵێم: " **گەر ئەو نەوانەی مەککە نەبان؛ کە تێکڕای ڕێچکەو ڕێڕەوی مێژوویان بەجارێك گۆڕی‌و تەوژمی ژیانیان سەرەو بن کردو سەرلەنوێ جیهان بەرەوئاسۆیەکی نوێ کەوتەوە سەر خۆی، کەوابوو ئەوە نەوەکانی مەککە بوون، نەك خوودی مەککە** ".

لێرەدا چەند دیمەنێك هاتە پێش چاوم، وا دەبینم گەورەو سەییدی قورەیشیش بەتەنها تەوافی بەیت دەکاو چواردەورەکەشی ئەونەمەی بۆ بەجێهێنانی کارەکەی بە چەشنێکی خاکی‌و ملکەچییەوە بەڕێدەکەوێت، گاڵتەو لاقرتی پێدەکەن‌و قسەی هەڵیت‌و پەڵیتی پێدەڵێن‌و. دەستی سووکایەتی‌و ئازارو ئەشکەنجەی بۆ درێژ دەکەن، دواتر تەماشام کرد دوای ئەوەی تەوافەکەی بەجێهێناو هەوڵیدا بچێتە نێو بەیتەوە، کەچی " **هوسمانی کوڕی تەلحە**" کە مجێوری (سادن)

کەعبە بوو نەیێهشت، پێغەمبەری خودا (د.خ) فەرموویی: "**ئەی عوسمان، ڕۆژێك دەبێت کلیلی کەعبەدەکەوێتە دەستم و لەو شوێنەدا دایدەنێم کە ئارەزوو دەکەم**"، فەرمووی: "**ئەو ڕۆژە هەموو قورەیش زەلیل دەبن و بەهیلاکا دەچن، بەڵام تۆ تەمەنت دەبێت و لەو ڕۆژەدا سەربەرزیت**"، دواتر وەك ئەوەی کە بەچاوی خۆم لەرۆژی فەتحدا بیبینم، تەوافی بەدەوری بەیتدا کردو، لەچواردەوریدا کۆمەڵێ لەو هاوەڵانەی کە بەڕۆح و گیان خۆیان بەقوربانی پێغەمبەری خودا (د.خ) دەکرد کۆبووبوونەوە. دواوای لەمجێوری کەعبە کردو فەرمووی: "**ئەی عوسمان ئەوە کلیلەکەیە، ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفادارییە**".

لەڕاستیدا مێژوو شاهێدی ئەوەی دا، کە نەك تەنها کلیلی کەعبەی کەوتەوە دەست؛ بەڵکو کۆی ئەو کلیلەی کەوتە دەست کە دەیتوانی تێکڕای ئەو قوفڵە ئاڵۆزانەی مرۆڤایەتی کە هەرچی عاقڵەکانی دونیا هەیە دەستەوسان بوون لەکردنەوەیدا بکاتەوە، کلیلەکەش ئەو قورئانە بوو کە دابەزییە سەری، ئەو پەیامە بوو خودا بەهۆیەوە بەڕێزی کرد، کە ئەمێستاش یارمەتی پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات و کێشە نوێیەکانیان پەرت و قوفڵەتازەکانیان دەکاتەوە.

دوا بەدوای بەجێهێنانی فەریزەی حەج و، بەو پەڕی خۆشەویستی و هەستەوە و، بەوەفاداری و دڵسۆزییەوە و، بەو نەزاکەتەی جارانەوە ڕوومکردە مەدینەکەی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست (د.خ)، مەدینەی مونەوەرە، وەك ذالی گەورە لە شا بەیتەکەیدا کە بۆ مەدینەی نوسیوە و من بەشا بەیتی ئەو پیاوەی دەزانم لەڕووە

عیرفانییەکەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی زۆر جاران وتوومە نالی عاریف نییە بەڵام بە هەموو واتای وشە شاعیرە، یانی هێندەی شاعیریەتی تێدا بەرجەستەیە، ئەوەندە عاریفییەتی تێد نەخەملیووە ؛ وەلێ گوتوومە مەحوی عاریفە بەلاّم وەك نالی شاعیر نییە ئەوە بۆچوونی خۆم بووە دەربارەی ئەو دووزاتە موبارەکە لەوانەشە هەڵە بم، کە دەفەرمووێت:

ئەسسلام ئەی ساکینی ریازی مەدینەی مونەوەرە

لـــوتفێ بکە و بفەرموو مەدیـــنەی مـنەو وەرە

بەڵێ هەرچی نارەحەتی‌و بێتاقەتی سەفەرەکەم بوو، دام بەکۆڵمداو وەك ئەو کاروانچییەی کە بۆ یەکەمینجاریەتی فەزا پڕ بکا لە نوورو ڕووناکی‌و سەکینە، کەوتمە ڕێ، گەشمتە مەدینەی مونەوەرەو، دوو ڕکات نوێژم لەمزگەتەکەی ئەو نازدارەدا (د.خ) بەجێهێناو سوپاسی خودام کرد کە بە مەدینەی خۆشەویستەکەی (د.خ) شاد بووم، دواتر لەبەردەم مەرقەدی پیرۆزیا وەستاموو، بە تێکرای ئەو منەتانەی کە هەرگیز ناتوانم پاداشتی بدەمەوەو قەت ناتوانم مافی خۆی پێبەم، سلاّوتم لەسەرداو (د.خ) سەلامم لێکردو (د.خ) شایەتیمدا کە بەڕاستی پەیامەکەی گەیاندو ڕاسپاردەکەی بەجێهێناو مۆچیاری ئوممەتەکەشی بەهەرچی خێرو چاکە هەیە کرد، لەپێناوی خودادا هەرچی لەدەست هات لەجیهادو هەوڵ‌و کۆشش بەجێی هێناو، پەرستشی خودای خۆی کرد هەتا بەڕووسوورییەوە گەڕایەوە لای . دواتر سلاّوم لە هەردوو

هاوەڵی بەڕێزو بەوەفاو دڵسۆزی کرد، کە ئەمێستاش مێژووی مرۆڤایەتی هاوەڵانێکی لەوان دڵسۆزترو وەفادراتر، جێنشینو وەزیرێکی بەهێزتری بەخۆوە نەدیوە ( خودا لێیان رازی بێت)، پاشان ڕوومکردە گۆڕستانی بەقیع، ئەو پارچە زەوییە چکۆلەیەی کە مەزنترین سامانی ڕاستگۆیو پاکیو چاکیو وەفاداری لە کۆش گرتووە، لەوێدا پیاوانێکی لێبوون کە ژیانی دونیایان کردە قوربانی دوارۆژو، مانەوەیان لەخاکو نیشتمانو جێگەو ڕێگەی خۆیانا کردە قوربانی کۆچو تاراوگەو غەریبی، ئەمەشیان لەپێناوی پارێزگاری کردن لە باوەڕو ئیمانە ڕاستەقینەکەیان، هاوکات دراوسێیەتی پێغەمبەری خودایان (د.خ) کردە قوربانی خزمانو خۆشەویستانیان، ئیدی بەهیچ کلۆجێ جگە لەو(د.خ)بۆ کەسێکی دیکە نەگەڕانو نەیانگۆڕییەوە بەهیچ شتێکی دی، بۆیە خودا لە پەسنیانا دەفەرموێت: **﴿من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه﴾** ( **الأحزاب: ٢٣**) واتە:" **لەناوخاوەن باوەڕاندا پیاوگەلێکی وا هەن، ئەو پەیمانەی بەخوایاندا، پێکیان هێناو ڕاستگۆ بوون لەتەکیا**".

دواتر بەرەو (ئوحود) وەڕێکەووتم، ئەو پارچە زەوییەی کە بوو بە جوانترین ڕۆمانو هاوکات مەزنترین کاریگەری لەسەر مێژووی مرۆڤایەتی بەجێهێشت، ڕۆمانی باوەڕو یەقین، ڕۆمانی پاڵەوانیو وەفادارییو خۆشەویستی پاکو وەلائی نەگمەن، وەك ئەوەی گوێم لە ئەنەسی کوڕی نەزرە کە دەیفەرموو:" **من بۆنی بەهەشتم لە قەدپاڵی**

ئوحودەوە بۆ دێ''. ئەو دەمەی هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەری خودا (د.خ) لەنێو خەڵکیدا بڵاوبووبووە هەریەك لە سەعدی کوڕی موعازو ئەنەسی کوڕی نەزر دەیانفەرموو: " ئیدی دوای پێغەمبەری خودا (د.خ) چیمان بەسەر دونیاوە ماوە یان چی لەژیانی دونیا بکەین"، لەو لاشەوە ئەبو دوجانەم بینی کە خۆی دەدایە بەر ئەو تیرەی بۆ پێغەمبەری خودا (د.خ) ڕەوانە دەکراو، تیرەکەش دەچوو بەپشتیا، هەر لەوێدا تەلحەی کوری عویەیدوڵلا دەستەکانی کرد بە قەڵغانو دایە بەر شمشێرو دووچاری شەلەل بوو، لاولاشەوە ئەوە لاشەی موفەڕکی حەمزەیە کەوتووەو سووکایەتی پێدەکرێت (مُثَّل بە)، هاوشانی ئەوانیش ئەوە خۆشگوزەرانترین گەنجانی قورەیش موسعەبی کوڕی عومەیرە کە لە ئوحوددا شەهید دەبێ، ئەو کەسەی پارچە قوماشێکیان دەست نەدەکەووت تا ئەو هاوەڵە بەرزەی پێداپۆشن، تەنانەت کە سەریان دادەپۆشی قاچی وەدەردەکەووتو بەپێچەوانەشەوە، ئای خۆزگە تەنها کەسێك لەجیهاندا توانیبای تۆزقاڵێ لەم وەفاو خۆشەویستیە بخوازێت و، شتێك لەو باوەڕو یەقینە ببەخشێتە جیهان، ئیدی ئەو دەمە ئەم زەوییە دەگۆڕا بەزەوییەکی دیو جیهانیش بەجیهانێکی جیاوازتر.

ئەو دەمەی پێیان وتم باسی حیجازمان بۆ بکە، وتم: قسەکردن دەربارەی حیجاز تامو ڕەنگێکی تایەبەتی هەیە، چونکە کۆی قسەکان بەدەوری پیاوێکی مەزندا خولدەخواتو، پەیوەست دەبێت بەپەیامو

مێژووەکەیەوە؛ کە ئەویش قسەکردنە دەربارەی لانکەی ئیسلام‌و شاری پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ).

***

## بیعسەتی موحەممەدی ﷺ[56]

گەشتێک بەنێو جیهانی سەدەی شەشەمی مەسیحدا بکەو، هەرگیز کۆی ئەو تەلارو ئەپارتمانە بەرزو دامەزراوانەو، ئەو پۆشاکو جلوبەرگە نایابو ڕازاوانەو، کۆمای زلی[57] زێڕو زیو بەفەتارەتدا نەباتو گزیت لێنەکات، چونکە تێکڕای ئەوانەی کە بەدیی دەکەیت تەنها کۆمەڵێ وێنەی دێرینو شوێنەواری کۆنن. بەڵام سەیر بکە تا

---

[56] - لە پەرتووکی (معقل الإنسانية)ی دانەرەوە وەرگیراوە. غوڵامی

[57] - ووشەی (کۆما)مان لەبەرامبەر ووشە عەرەبییەکەی کە (قنطار)ە، داناوە، پێشی ئەوتری: "کینتار" کە بڕی ٤٤,٩٢٨ کیلۆگرامە، بەڵام من ووشەی کۆمام پێجوانتر بوو لە کینتارو هەستم کرد کینتار زۆر نزیکە لە پیتە عەرەبییەکەوە. غوڵامی

بزانی بەهیچ کلۆجێ پیاوەتیو مرۆڤدۆستی تێدا بەدی دەکەیت، هەناسەت بگرەو گوێڕادێرە. تا بزانی دەمارێك هەیە لێبداو دڵێکی تێدایە ببزوێت.

ژیان وەك دەریایەك دێتە بەرچاوت کە تێیدا نەهەنگە گەورەکان نەهەنگە چکۆلەکان لووش دەدەن، هەرچی جیهانیشە وەك بێشەو دارستانێکە کە شێرو گەلەسەگو بەرازو گورگەکان پەلاماری بەرخو گێسكوئاسکەکان دەدەن، ئەو دەمە دەزانیت کە چۆن شەڕ بەسەر خێرداو خراپە بەسەر چاکەداو هەواو ئارەزوات بەسەر عەقڵو ئاوەزداو هاوکات وورگ بەسەر رۆحدا زاڵ بووە؛ بەڕادەیەك زەوی دەستدرێژی بێعەقڵانە دەکاتە سەر ئاسمانو، گوریسەکەی بۆ ئەستێرەی پرشنگداری گەلاوێژ دەهاوێژێ.

سەردەمانێ دونیا بوو بووە بازاڕی بانگەشە، تێکڕای کەلو پەلەکانی لە مەلیكو وەزیرو دەوڵەمەندو نەدار پێکهاتبوو؛ کە بەچەشنی کاڵا، کڕینو فرۆشتنیان پێوەدەکرا، ئایا لەم ئەزموونەدا گەنجێك هەیە پەیدا ببێتو رێگەدا نەدا بفرۆشرێو بەدەنگی بەرز هاوار بکاو بڵێت: "ناتوانم لەم ئاسمانە فراوانەدا بفڕم، بەهیچ شێوەیەك ئەم ژیانە شوێنی منی تێدا نابێتەوە، چونکە خودا ژیانێکی دیکەی فەراهەمهێناوە، ئیدی چۆن پڕو گەوهەری مرۆڤایەتی خۆم بە بەپارچە شکاوێکی ئەم جیهانە چکۆلەیە بفرۆشم"؟ وەك نوورسی دەفەرموێت: مرۆڤی باوەڕدار دواڕۆژێکی جاویدانیو ئەبەدی ناگۆڕێتەوە بە ژیانێکی کاتی، واتە چلۆن دەبێ شووشەیەکی شکاو بە گەوهەرو زێر بگۆڕییەوە؟! مەگین

کەسێك ئەو کارەی لێبووەشێتەوە لەو پەری گێلیدا بێت. هەرچی "مەحوی" گەورەش هەیە، وێنای ژیانی هەردوو دونیای لەم چەن دێرە شیعرەدا بۆ کردووین و دەفەرموێت:

**ئەوی ئەمڕۆ بـەدەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلـووق**

**سبحەی دەبینی لەدەوری نەعشیا وەلوەلەی مەخلووق**

**بـە پـەل پەلکردنی سبـحەی ئەگەر ببوایـە باوەڕیان**

**دەبوو قەت بەم حەددە نەیوایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق**

**بـە ناوی تێگەیشتین ئێمـــە دنیا هــــەر سەرا بێ بـــوو**

**هەموو دەشچن بەخنکان و لەروشکیشە مەلەی مەخلووق**

**لەســووقی دەهــردا دوکانی هەرکەس موددەتی عومرە**

**گەوهەر دانە بە پشقڵ دانە "مەحوی" مامەڵەی مەخلووق**

بەئەندازەیەك وایلێهاتبوو تێکرای شارو گەلەکان، هۆزو تیرەکان، خێزان و ماڵەکان، بوو بوون بە چەند بەڕێوەبەرایەتییەکی بچووك و، ئەوانەش کە خوویان بە تەماح و فیزو دەمارەوە گرتبوو وەك کەسانێکی سپڵە تێدا نیشتەجێ بوو بوون، نە دەیانهێڵا کە سێك لەشوێن ئەوان بێتە ناویەوەو، نە ڕێگەی نێوە باڵێکیان بۆ خەڵکیش جێهێشتبوو، بەهیچ کلۆجێك لەدەرەوەدا ژیان بەدی ناکەن و، نازانن یان نایانەوێ بزانن کە مرۆڤایەتی زۆر لەو شوێنەی ئەوان گەورەترو جیهانێکی پان و

پۆڕترە، بەرادەیەك ژیان بووبووە شوێنی کڕین‌و فرۆشتن‌و کێبڕکێ لە فێڵ‌و تەڵەکەدا، هەرچی مرۆڤایەتیشە بوو بووە جەستەیەکی بێکەڵك کە تێیدا هەستت بەگەرمی رۆح یان سۆزی دڵ یانەخۆ بەرزی نەفس نەدەکرد.

دەمێك بوو لەسەر توێکڵی مرۆڤایەتی دارستانێکی چڕو، گژوگیای شەیتان ڕوا بوون، کە لەنێو قامیشەڵانەکانیدا (آجام) دڕندەو، خشۆکی ژەهراوی‌و، زۆنگاو هەبوون کە چەندین جانەوەرو گەجەڕو گوجەڕی پێوە ئاڵسکابوو، لەو دارستانەدا چەندان دڕەندەی سامناك‌و، باڵندەی بریندار هەبوون، لەو زۆنگاوانەدا چەندین مێش‌و مەگەزی پیس هەبوون کە خوێنی مرۆڤەکانیان هەڵدەمژی؛ بەلاّم لەو جیهانەی کە جمەی دەهات لە بەشەر کەسێکت بەدی نەدەکرد شیاوی ئەوە بێ پێی بووترێ بەشەر یان مرۆڤ، هەرچی پیاو هەیە پەنایان بردە ئەشکەووت‌و ماڵ‌و کەنیسەکان‌و لەوێدا پارێزگاریان لەدین‌و ژینیان دەکرد، یان بەدەم تەوژمی ژیانەوە فەلسەیان لێدەداو شیعریان دەچڕی، لەنێو شاریشدا هەر بۆ خوا تاقە پیاوێکت بەدی نەدەکرد کە قەلاّچۆی دوژمنان بکاو ستەمدیدەکان هەڵسێنێتەوەو دەستی میهر بەسەریاندا بێنێ.

لەناکاو ئەم جەستە کەوتووە کەوتە جووڵە، ئەم لاشە مردووانە لەرزینێك کە هێلانەی ئەو باڵندانەی لەسەر ئەم جەستە بیمارە هێلانەیان کردبوو کەوتنە لەرەو، دواتر هێلکەی کردو بێچوویشی بوو؛ کە خۆی وای هەست دەکرد مردووەو ناجولێتەوە، تێکرای هێلانەی

کاکڵەمووش‌و جاڵجاڵۆکەکان پەرت‌و هەپروون بوون‌و کەوتنە خوارەوە، کە زۆرێك لە مێژوونووسان‌و سیرەتنووسان‌و ریوایەتکاران بەزمانە سنووردارەکەی خۆیان بە شەقبوونی تاقی (ایوان) کیسراو کوژانەوەی ئاگری ئاگرپەرستانی لێکدەدەنەوە، ئایا نابینیت چلۆن تێکرای تەلارو ئەپارتمان‌و بورجە گەچکراو بەهێزو دامەزراوەکان، بەتەنها جووڵەیەکی سکی زەویی دەلەرێنەوەو پەرتەوازە دەبن‌و وەك گەڵای پایزیان لێدێ‌و دەبنە کوێشکەی خوراو سەروژێردەبن، ئەدی چۆن دەبێت تێکرای ئەو سیستەمەی کیسراو کۆشك‌و تەلارانەی کە فیرعەونەکانی ئەم چەرخە بونیادیان ناوە بە هاتن‌و بیعسەتی پێغەمبەری مرۆڤایەتی (د.خ) و هەڵهاتنی بەرەبەیانی کامەرانی‌و دادپەروەری لەجیهاندا؛ نەکەونە لەرەو هەپروون هەپروون نەبن‌و چەشنی کای بەم بایان لێنەیەت؟!

**موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ئەلهاشمی** (د.خ) لە نێوجەرگەی جیهانی پێشکەوتوو ئاوەدان کە مەککەیە هاتە دونیاوە، هاوارێکی کرد کە دارستان‌و بێشەو کێوەکان بەیەك دەنگ لەتەکیا وتیانەوە: " **هیچ خودایەك لەم گەردوونەدا نییەو، موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە**" بەیقێکی کورتە بەڵام دنیایەك لە واتاو حەقیقەتی گرتۆتە ئەستۆ.

مێژوو شاهێدیی ئەوە دەدات کە بنەما درۆو ساختەکانی ژیان‌و، کۆڵەکەکانی سیستەمە درووستکراوە ستەمکارەکان هێندەی ئەو وشە کورت‌و سادەیەی [شایەتوومان] مرۆڤایەتی نەهێنایە لەرزەو کاریگەریی نەبوو. هەرچی بیری مرۆڤایەتیشە لەوەوپێش هەرگیز وەها چەپۆکێکی (طارئة) پڕ ژانی بەرنەکەوتووەو نەیتاساندووە، بەراپەیەك

بەو لێدانە بیرو زیهنی گێلی مرۆڤایەتی دووچاری ئازار بووەوەو شێت بوو. وتیان ﴿ **أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ** ﴾ ( ص: ٥) واتە: " **چۆن دەیەوێ لەجێی ئەو هەموو بتانەی دەتانپەرست، هەر خودایەك بپەرستن؟ ئەمە زۆر شتێکی سەیرە**". بۆیە ڕابەرانی ئەم ژیانە پێیان وابوو کە ئەمە پیلانێکە دژی ئەم ژیانە باوە کە بتپەرستییە ئامادەکراوەو سازکراوە، بۆیە پێویستە بەزوترین کات قەلاچۆبکرێ‌و لەنێوببرێ: ﴿ **وَانطَلَقَ الْمَلأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ** ﴾ ( ص: ٥) واتە:" **کەڵەپیاوانیان کەوتنە ڕێ‌و [ پێیان وتن] بەردەوامبن لەسەر پەرستنی خوداکانتان، لا مەکەون‌و خۆڕاگر بن، بێ سۆ ئەمە ویستی مەیە**[٥٨]". بێهیچ خوت خوتەو گومانێ؛ بەگشتی ئەم وشەیە گورزێکی جەرگبڕو چەپۆکێکی پسێنەربوو بۆ نێو دەم‌و پلی بیرو فیکرە هەڵیت‌و پەڵیتەکانی ژیان، کە بەهۆیەوە جێ پەنجەی لەسەر پەیکەری ژیارو ڕامیاری مرۆڤایەتی بە تێکرای پایەکانییەوە مۆر کرد.

ئەمێستاش ئەم وشەیە ئەوەمان پێ بەژێ کە ئەم ژیانە بەچەشنی قامیشێکی وشکانی‌و کێوی نییە کە هیچ کەس بایەخی پێنەدات، بەڵکو ئەو باخچە ڕازاوەیە کە خودا بۆخۆی پەیمانی چاکسازیی‌و پارێزگاریی داوەو هەرخۆشی چاندوویەتی، بێگومان مرۆڤیش ڕەیحانەی بۆنخۆشی ئەم باخچەیەیەو ڕۆح‌و ڕەوحی بەهارە، ئیدی چۆن دەبێ ئەو ڕەیحانەیە بپوکێتەوەو پێشێل بکرێ، یان باڵندە بیرفێنێ‌و ڕەشەباش بیبا بەهەوادا، بێئەوەی کارو پیشەکەی بەئەنجام گەیاندبێ‌و شوێنێکی

---

[٥٨] - بێسۆ: بێگومان. مەیە: ئێمەمانانە. غولامی

شیاوی بۆخۆی وەدەستخستبێ، کەوابوو هەر فیترەتەکەیەتی داخوازی ئەوەیە کەخودا بەتاک‌و تەنهایی بپەرستێ‌و، دەروونی بەرزو بڵندیشی دەخوازێ کە جگە لەڕەزامەندی خودا بە هیچ شت گەلێکی دی باوەڕنەکا. هەرچی کەرامەت‌و شەرەف‌و نامووسی ئەو مرۆڤەشە - ئیدی پیاو بێ یان ژن- وادەخوازێ کە لەم ڕێگەیەدا گیانی بەخت بکاو، دارای هەرچییەکە لە عەقڵ‌و بەهرە، لە سەروەت‌و پیشە بیخاتە گەڕ، لەبەرامبەردا مرۆڤیش بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە خۆی بداتە دەستی جەستەو ڕۆح، کێو و ڕووبار، دارو بەرد، سامان‌و ناوبانگ، یان هیچ دەسەڵاتێ؛ چونکە ئەو زۆر لەدرووستکراوەکانی دیکە بەرزترەو لەبەردەم پەروەردگارەکەشیدا بچووك‌و دەستەوەسانە، خودا جیهانیشی تەنها بۆ خزمەت‌و گوێڕایەڵی خۆی درووست کردووە، بەدیارچاوی بنیادەم تێکڕای ئەو فریشتانەی کە دارای دەسەڵاتی بەهێزی گەردوونن، کڕنووشی شکۆمەندیی‌و تاك‌و تەنهاییان بۆ خوداوەندی بەرزو بڵندو پڕشکۆ برد؛ بۆ ئەوەی تێکرای مرۆڤایەتی ئەوە بزانێت کە ئەم گەردوونە بەگشتی ملکەچی فەرمانی ئەو پەروەردەگارەیەو خۆبەکەمزان و خاکین لەهەمبەر ئەو خاوەن دەسەڵات‌و شکۆمەندەدا، بۆیە فەرمان ئەکاو نەهیش دەکا، هاوکات بەو وتەی خۆی کە " لا إله الا الله"یە بۆ بەرژەوەندییە پاکەکان بەکاریان دێنێ‌و، بۆ بەجێهێنانی کارو و بارە دادپەروەرییەکەی هەڵیان دەسوڕێنێ.

لەڕاستیدا ژیان تاکە تیری (السهم) مرۆڤە، وە گەر مەبەستەکەی خۆی پێکا بەدڵنیاییەوە ئەوە تیر ئەندازێکی چاکەو، گەر نیشانی خۆی نە

پێکاو سەری لێشێوا؛ ئەوە تەنها بەدبەختی بۆ دەمێنێتەوەو تیرەکەی لەکیس نەدات، دەبێت چاك لەوە ئاگادار بێت کە ژیان دوا وێستگەی قۆستنەوەی ئەو هەلانەیە کە هەرگیز نابێت لە دەست بدرێ‌و بە چاوێکی ساناوە تەماشا بکرێت؛ چونکە دواجار ئەوە تەنها ژیانە کە دەتوانێت غافڵگیری بکاو، تەواوی ئاواتەکانی بنێتە چاڵ، بەڵکو دەبێت زۆر دلێرانەو زیرەکانە مامەڵە لەتەك ژیاندا بکاو، لە ئەزموون‌و تاقیکردنەوەو، لە خۆخستنە جێگەو ڕێگەی ترسناك‌و قوماری دونیادا لەدەستی نەدات، وێڕای ئەوەش دەبێت بە وریاییەوەو چەشنی پشکۆو ژیلەمۆ بۆ ژیانی خۆی بڕوانێ‌و هەموو کات‌و ساتێکی وەك ئاگایی کاژێر لە میلەکەی خۆی ئاگادار بێ‌و، سواری کەشتی کوێر نەبێت، چونکە وەك ووتمان ئەوە تاکە هەلی ژیانی ئەوە، قومارکردن بەژیانی مرۆۃ خۆی‌و سەرمایەیەوە زۆر زشت‌و ترسناکەو تەژییە لە قەباحەت! پێویستە کاروانی ژیان دارای دەڵاڵ‌و بزوێنەرێکی زیرەك‌و زرنگ‌و ئەزمووندار بێت؛ لەبەرئەوەی بیابان ترسناکەو ڕێگرانیش کەمنین. کەوابوو پێویستە لەبەر ڕۆشنایی پێغەمبەرێتی و نیگادا ڕێبکەین، چونکە جیهانی ئەندازەو پێوانە گەلێك تاریکەو چاو تێیدا بڕناکات ﴿ ظلمات بعضها فوق بعض﴾ (النور:٤٠).

پێغەمبەرێتی تەنیا ڕۆشنکەرەوەی ئەم تاریکییە بەسەر یەکدا کەوتووەیەو، تەنها کانگای زانست‌و فەرمانی خودای گەورەیە، بەدڵنیاییشەوە پێغەمبەر (د.خ) سازکەری ئەو پەیوەندییەو واسیتەی نێوان حەق‌و درووستکراوەکانە لە ڕووی ڕێنموونی‌و هیدایەتەوە ﴿ وما

**ینطق عن الهوی﴾** ( النجم: ٣). پێغەمبەری خوداش (د.خ) تەنها ئەو زاتەیە كە هێڵەرەوەی ئەم پەیوەندییە بەم سەرچاوەیەوەو، كۆتا پێغەمبەرە (د.خ) كە كۆی ئایینەكانی دیكە بەهاتنی شۆرانەوە، ئەو (د.خ) لە هەموو ئان‌و زەمانێكدا پێشەوای مرۆڤایەتی‌و مەڵبەندی حیكمەت‌و كەماڵ بووەو، هاوكات ئەو وێنەو بالانواڕە بووە كە تێكڕای ئەوانی دی لە هەموو ولات‌و كون‌و قوشبنێكی ئەم دونیایەدا، لەبەر ئەودا بەردەوامیان داوە بەكاروانی ژیانیان‌و كردوویانەتە سەرچاوەو سەرچەشمەی وەرگرتنی ئاداب‌و ئاكارو ڕەوشت، گومانیشی تێدا نییە پەیك‌و پەیامەكەی نەرمانی هەموو دەردێك‌و، هەتوانی گشت برینێكە، ئەو كەسەشی بەئەنقەست لەو پەیامەی ئەو دوور بكەوێتەوە وەك ئەوە وایە قەتماخەی برینێكی ساڕێژ نەبووی هەڵدابێتەوەو ئیدی هەردەم ڕووی لەسەر گەردانی‌و خەسارەتمەندی دەبێت، كە بەدڵنیاییەوە زۆرێكمان بەدرێژایی مێژوو لەم چەشنەمان لەڕێگەی خوێندنەوەی مێژووەوە بەدی كردوە؛ كە بۆ هەندێكیان بوو بە پەندو بۆ ئەوانی دیكەش بوو بە ئەزموونێك كە هەرگیز لەیاد ناكرێ، كەوابوو بەهیچ شێوەیەك باوەڕ دانامەزرێ گەر بڕوات بەتێكڕای پەیامبەران بەگشتی‌و پەیامبەری خۆمان (د.خ) بەتایبەتی نەبێت، خودا دەفەرموێت **﴿ مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللهِ﴾ (الفتح:٢٩).**

گومانی تێدا نییە كە بیرو فیكری مرۆڤایەتی لەسەدەی شەشەمی میلادیدا هێندە دووچاری شەلەلی فیكری‌و هەستی گێلانە بوو بووەوە، بەهیچ كلۆجێ نەیدەتوانی‌و بەتەواویش دەستەوسان بوو شتگەلە

ماددیی‌و هەستپێکراوەکان تێپەڕێنێت، نەشیدەتوانی تایبەتمەندییەك بە مرۆڤ ببەخشێ کە باوەڕی بە پێغەمبەرێتی (د.خ) و نیگای ئاسمانی هەبێت.

ئەوان زۆرینەی شتەکانیان بە پێوانەی باو باپیرانیان پێوانە دەکرد، ئیدی هەرچییەکیان لە بیدعەو گەندەڵی‌و شەڕ یان نمونەیەکی نوێی مرۆڤایەتیان وەدی کردبا بە پێوانەی باوباپیرانیان دەیان پێوا، لە نێویاندا چەند پیاوێکیان هەڵبژاردبوو کە پێیان وابوو لەپلەی هەرەبەرزو ئەوپەڕی مرۆڤایەتیدان، هەرکات کەسێکی پیتۆڵ‌و عەبقەریی یان پێغەمبەرێکیان تێدا دەرکەوتایە؟ هەر بەو گوێرەیە پێوانەیان دەکرد، بۆیە هەرچی لەتوانایندا هەبوو خستیانە گەڕو، هەرچیش لە بارگەی فیکرو بیریاندا هەبوو خستیانە سەردەست‌و هێنایانە مەیدانەوە، ئیدی بەو پێوانەو کێشانەی بیرو فیکری خۆیان بۆیان دەرکەوت کە ئەم -موحەممەدە(د.خ)- یان سەروەت‌و ماڵ‌و سامانی دەوێ یان ئافرەت‌و گەورەیی و شکۆ و سەرۆك هۆزیی و گەورەی عەشیرەت‌و تیرو تایەفەی دەوێ، یان بەشوێن هەواو ئارەزواتدا دەگەڕێ‌و شەیدایە، ئەوان چونکە بەچاوی مرۆڤەوە یان بەچاو و دیدی پێغەمبەرێتییەوە (د.خ) تەماشای پێغەمبەریان نەدەکرد (د.خ) و وایان دەزانی ئەویش چوون خۆیانە، کوردیش دەڵێ **تەیری گول هاشق بەداری ژەقنەمووتە**، بۆیە (**موتبەی کوڕی رەبیعە**)یان نارده لای (د.خ) و

قسەی لەگەڵدا کرد[59]، تێکڕای ئەو قسانەی کە هوتبە بە پێغەمبەری (د.خ) گوت لێکدانەوەو وێنای بیرو فیکرێکی ڕاستگۆیانەو هەستو نەوازشو دەروونی کەسانی ئەو سەردەمە بوون، وتی:" ئەی کورەزاکەم، گەر بەم پەیامەی -وەك خۆت دەڵێیت- بۆ ئەوەیە ببیتە خاوەنی ماڵو سەروەتو سامان؛ ئەوا ئەوەندەت بۆ کۆدەکەینەوە تا لە هەموومان ماڵدار تر بیت، وەگەر دەتەوێ شەرەفو گەورەیی وەدەست بخەی؛ ئەوا دەتکەین بەگەورەو پێشەوای خۆمان، بۆ ئەوەی بەبێ تۆ هیچ کارو فەرمانێ یەکلایی نەکرێتەوە، گەر موڵك یان پادشاییت دەوێ ئەوا خۆت هەموو شتێك بە[60]".

---

[59]- بۆیە لەزۆر شوێندا ناوی پێغەمبەر(د.خ) ناهێنم، پێم وایە هەر سڵاواتەکەی بۆ بنێرم جوانترەو، بە حسابی گەڕانەوەی زەمیر بۆ لای مەرجەعو سەرچاوەی خۆی مامەڵەی لەتەکدا بکەم جوانترە، هەروەك: لە پەرتووکی زانایانو دانایانی پێشوودا ئەم چەشنەمان دێتە بەرچاو، کۆی ئەمانەش تەنها ئەدەب کردنە لەو پێغەمبەرە نازدارو خۆشەویستە(د.خ)؛ سا خودایە لەبەر خاتری حورمەتی ئەو پێغەمبەر گیانە (د.خ) لە ئێمەو دایك و باوکمان خۆش ببەو خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بکەو لەکۆی تاوانەکانیان خۆشببە؛ چونکە زۆر ئازاریان بەدەستەوە چەشتووینو، ئێمەش بێرەحمانە گەلێك تاڵی ژیانمان پێ چێژاوون. وەك "مەحوی" دەفەرموێت:

**بەر شەفاعەی ئەو شەفیعەم خەی خودا**

**خۆشم و ئەهل و خزم و داك و بـــاب** غولامی

[60]- بنۆڕە: البداية والنهاية لابن كثير.

ئەو وەڵامەی پێغەمبەریش (د.خ) شاهێد حاڵێکی دروستی پێغەمبەرایەتی بوو، نمایشێکی ڕاستگۆیانەی هەڵوێستی ئەم ئوممەتە نەوجەوانە بوو، بۆی سەلماندن کە ئەو بەهیچ شێوەیەك بە شوێن پلەو پایەی پووچو بەتاڵی دونیاییو سەروەتو سامانی کاتیدا ناگەڕێو، عەوداڵی هیچ کام لەوانەی کە ئەوان خستبوویانە بەردەمی نییە؛ چونکە دەروونو نەفسییەتی ئەو (د.خ) زۆر چاکترو بەرزترە لەو دەروونە گلاوەیان هێندەی بەرزی ئاسمانو کەشکەلانی گەردوون، ئەو هەردەم لەخەمی داهاتووی ئەم ئوممەتە بێهیممەتەدا دەگەڕێو عەوداڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی هەتا هەتاییە بۆ دەربازکردنی ئەم گەلو هۆزو تاقمە عەقڵو ئاوەز قەتیسکراوەی کە بەهەندێ بنەمای پووچو فیکری هیچ لەبارونەدا نەبوو بەستراوەتەوە، ئەوان ماخۆلانی بەهەشتێکی بەستراو قەتیسکراویانەو، ئەمیش (د.خ) بەشوێن بەهەشتێکی نەبراوەو پەلکێشکردنی ئەو نەزانانەدایە بۆ ئەو بەهەشتەی کە هەتاهەتییو جاویدانییە، ئەو (د.خ) تەنها نایەوێ مرۆڤ لەژێر ڕکێفی هۆزو تیرەو عەشیرەتێکدا مەلاسبدرێو بەگوێرەی فەرمانو داخوازی ئەوان بێتو بجوڵێتەوەو بە یەکجاری ببێتە کۆیلەو بەردەی ئەوان، بەڵکو دەیەوێ گەورەیەتیو شکۆمەندی بگەڕێتەوە بۆ تاك بەتایبەت-ئیدی هەرکەسێك بێ- بۆ کۆمەڵگەش بەگشتی؛ چونکە تنۆك تنۆك ئاو دەبێت بەدەریا، ئەویش گەڕانەوەیە بۆ دەستی تاکە شکۆمەندی داپەروەر کەخودای تاكو تەنهایەو دارای زەمینەکان[٦١] و ئاسمانەکانە.

---

[٦١] - ئاماژەیە بۆ ئایەتی ﴿ ومن الأرض مثلهن﴾. غولامی

بەڵێ؛ ئەو پێغەمبەرە (د.خ) کاتێك بەم چەشنە لە کۆی ئەو دەست و کۆتیەندییە ڕزگاری کردن و، کاتێکیش جێگیری کردن تاوەکو دەوڵەتێك لەسەر بنەمای پەیڕەوی کردن لە ئایینەکەی و، بنەمای باوەڕەکەیان چێ بکەن، بەدڵنیاییەوە ئەوەیان جێبەجێ کرد کە بانگەشەیان بۆ دەکردو کەسانی دیکەیان هەڵدەنا بۆ پیادەکردن و جێبەجێکردنی، بۆیە مرۆڤ لە حوکمی مرۆڤەکانەوە چووە ژێر سایەی چەتری میهرو دلۆڤانی خوداو، ئیدی حوکم تەنها نەبووە موڵکی هۆزێك یان لایەنێك یان عەشیرەتێك، بەڵکو تێکڕای فەرمان و نەهییەکان بۆ خودای پەروەرێن خۆی دەگەڕانەوە.

بۆیە جێنشینی یەکەم (ر.خ) ئەوکەسەی کە عومەری فارووق (ر.خ) دەربارەی دەفەرمووێت [ خۆزگە تاڵە موویەك بوومایە بەسەر سنگی ئەبوبەکرەوە (ر.خ)]. لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرمووێت: [**لیتنی أن أکون خروفا یذبحنی أبو بکر)، واتە: بریا من مەڕێك بوومایەو ئەبوبەکر بیکردمایە بە قوربانی]**

**گەر دەبینی دەست و پەنجەی حەناییم**

**حەنایی چی هەمووی هە رخوێنە قوربان**

دەفەرموێت:" **کوێڕایەڵیم بکەن تا کاتێك من یەکوێڵی خودا دەکەم، گەر هەستتان کرد لەفەرمانی ئەو دەرچووم، ئەوا لێم دوورەپەرێزی بگرن**".

جێنشینی دووەم کاتێك زانی کە کوڕەکەی عەمری کوڕی عاس، لە کەسێکی هەژاری ڕەشپێستی قیبتی داوە، پێی فەرموو:" ئەوە کەی

**واتان لێهات خەڵکی بکەن بەکۆیلە، لە کاتێکدا خۆدا ئەوانی بە ئازادو سەربەست درووست کردووە".**

بەئەندازەیەك ڕەسولوڵلا (د.خ) ئەو هاوەڵانەی پەروەردە کرد بوو، هەیان بوو لەسەردەمی پێشەوا عومەردا کە دەینارد بۆ وڵاتی فارس، هەر وەك تاکێکی ئەو کۆمەڵگایە دەژیاو. گەر غەریبەو کەسێك لە تاراوگەو دوورە وولاتەوە سەردانیی ئەو شوێنەی کردبا نەیدەزانی کێ حاکمو کار بەدەستە ؟! تێکڕایان پێغەمبەر ئاسا (د.خ) دەژیان؛ بۆیە هەموویان ڕەنگو بۆی ئەو ئازیزەیان نەدا (د.خ)، شاعیری کوردیش لە پەسنیا فەرموویەتی (غەریبی تازە هاتووە نەیووت:" ئەم پێغەمبەرستانە") بەڕادەیەك ئەو کەسانەی کە والی شارەکان بوون لەو دەمەدا خۆیان بەکرێنشینو ڕێبوارێکی نەداری ئەم دونیایە دەزانی، بۆیە هەموو کەس بۆخۆی باری قورسی خۆی دەبردەوە ماڵەوەو بە کۆڵی خۆی کارەکانی بەجێدێنا، بەئەندازەیەك دەوڵەمەنترینیان لە دونیادا وەها دەژیا وەك ئەوەی ڕێبوارێکی نەدیدی ئەم دونیایەیە، بۆیە حەقی بوو کە هەردەم سووکایەتی بەلەزەتو چێژەکانی ئەم دونیایە دەکردو، هەرچی چاکەو باشەش هەیە لە هۆڕو بارگەکەی قیامەتیا دایدەناو بۆ ژیانێکی نەمری هەوڵی دەدا.

لەبەر ئەوە بوونی وەها ئوممەتێك لەگۆشەیەك لە گۆشەکانی جیهاندا وەك ڕەمزێکی ڕاستەقینە وابووە، کە جیاواز بووە لەتەك حەقیقەتە ماددیی‌و چێژە جەستەییەکان، هەموو تاکێکی ئەم ئوممەتە بە مردو زیندووییەوە بەدەنگی بەرز دەیاندا بەگوێی جیهاندا؛ کە لە پشت هەموو

هێزێکیماددیەوە هێزێکی ئاسمانیو، لە پشت ژیانی فانی ژیانێکی نەمری هەیە، بەئەندازەیەك؛ لەساتی لەدایکبوونی منداڵەکانماندا هەمان شتی بە گوێدا ئەچرپێنین یان هاوار دەکەین. وە گەرهەر بەم بڕوانامەیەوە دونیای بەجێهێشتو، جیهانیش وەك مەرگ چەقیبەستبوو، مۆرۆڤەکانیش تا بنی گوێیان لە دەریای بێ بنی ژیانا ڕۆچوو و، هەرچی حەقیقەتیش هەیە لەپشت حەقیقەتە ماددیەکانەوە شاردرابوونەوە، ئەوا لەو کاتەداو لەناکاو ئەنگێك بە گووتنی ( حي على الصلاة، حي على الفلاح) وە هاوار ئەکاتو، چی تەلیسمی جیهانی ماددیگەرایان هەیە تێکیدەشکێنێو، ئیدی حەقیقەتی ڕۆحی پرشنگدەداتەوەو، خەڵکیش تێکڕا لە هەموو شتێکی دونیا دەستیان دەتەکێننو دوای ئەم دەنگە بەسازو ئاوازە دڵپەزیرە دەکەون، هەرکاتیش شەو داهاتو تاریکی پەردەی دا بەسەر ڕووخساری ڕووناکیداو، خەو تەپییە چاوی ئەم جیهانە هاتو هاوارکەرو قیژەقیژکەرە ماددیەوە، ئیدی ئەبێت بە گۆڕستانێکی فراوان کە هیچ کەس ورتەی لێوە نایەو کەسیش بەدەمیانەوە ناڕواتو بۆ چاویدان چاوانی ماددە لێکدەنرێو، کانیو چەشمەی ژیانیش دەڕژێتە نێو دۆڵی مەرگەوە. ئیدی لەو شەوەزەنگە بەرەبەیانێکی پرشنگی جوانو ڕووناك سەرئەردێنێو جیهان دەگەشێتەوەو، مرۆڤایەتی تێکرا لە بانگوێژی بەیانی وانەی ژیانو چالاکیو هەوڵو تەقەلاو سوپسگوزاریو پەرستش دەڵێنەوە، وە هەرکەس لەم نێوەندەدا کەوتە چەنەدانو خۆی بە گەورە زانیو بە دەسەڵاتو ماڵو سەروەتو هێز ئەینازیو، بە زمانی حاڵ دەیووت: ﴿ انا ربّكم الأعلى﴾ یان ﴿ ما علِمتُ

لَكم مِنْ إله غَيْرِي﴾، كه گومانی تێدا نییه بەسەر نەفسی خۆیا هاواری كردووەو بەسەر خۆیدا قڕاندوویەتی ، ئەوا لەو كاتەداو لەتێكرای پارچه زەوی مەمەلەتەكەی خوادا، پیاوێكی خاكی لەسەر كورسییه بەرزو بڵندەكەی هەڵدەستێ‌و پڕ بەدەمی خۆی هاوار دەكاو دەڵێ:" الله اكبر الله اكبر"، بانگەواز بۆ خودای بەهێزو بەتواناو خاوەن پایە دەكاو لوتی خودای درۆین و فرت‌و فێڵاویی بەناخی زەویدا دەباو، دەڵێت: ﴿ جاء الحق وزهق الباطل إن الباطل كان زهوقاً﴾.



## پەیوەندی موسوڵمانانی عەجەم بە پێغەمبەرەوە ﷺ

داوم بە گورتەیەکی مامۆستا (عەتیق ئەڕڕەحمان ئەلسونیەهلی)؛ کە دامەزرێنەری گۆڤاری مانگانەی ( الفرقان)ە کە لە (کهەنەو)ی هیند دەردەچێت کەروت: لەوێدا تێچوونی(التعلیق) لەسەر گوتارێکی مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەلزییات داوە، کە لەگۆڤاری (الأزهر)دا بڵاوکرابووەوە، بەئەندازەیەك ئەو نووسینە لەجیهانی ئیسلامیدا تێکرای کەسانی بە ویژدان و باوەڕداری هەژان و تووشیاری تووڕەیی کردن، ئەو وەڵامەی مامۆستاش لەناواخندا ژیان و هێزی

تێڕوانینی موسوڵمانانی هیندو وڵاتانی عەجەمی لێدەباری‌و دەرخستەی خۆشەویستی‌و عیشقی لەڕادەبەدەری وان بوو دەرحەق بە پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ)، واشم بەباش زانی ئەو وتەیەی ئەلزییات بخەمە بەر دیدەی خوێنەران؛ بۆ ئەوەی پتر تر برایانی عەرەب ئەشنای ڕای ئەو کەسە بن".

وەرەو کاریگەری گەورە شاعیرێکی ئێرانی[62] چاو لێبکە، کەوا بە بەیتە نەبەوییە نەمرەکانی نێوبانگی دەرکردوەو بەیتێکی بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) وتووە کە لەچەرخی خۆیداو پاش خۆشی بوو بە ناسنامەی، ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خۆشەویست‌و(د.خ)دەڵێت: " **بۆ تەنها جارێك خۆم دایە پاڵ سەگەکەت، کەچی لەشەرماندا عارەقی خەجاڵەتی لە نێو چاوم دەتکا، لەبەرئەوەی خۆدانەپاڵ تۆ لەلای سەگێك لە سەگەکانی کۆڵانی شارەکەتدا ئەو پەڕی بێئەدەبیی‌و شەرم‌و غەرڕایی نەفسە**".

دەمەوێ بڵێم: "ئەمە بۆچوونی ئەو شاعیرەیەو، دانەر بەهیچ چەشنێ قسە لە گوتەی ئەو شاعیرەدا ناکات کە وێنای هەست‌و سۆزی بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) دەربرێبێت، گومانی تێدا نییە کە مرۆڤ زۆر بەڕێزترە لە سەگ‌و بەڵکو ئەوان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی دانراون، خوداش بۆخۆی دەفەرموێت ﴿ولقد كرّمْنا بني آدم ...﴾ دانەر. خۆم

---

[62] - گەورە شاعیرێکی ئێرانییە، بەوە نێوبانگی دەرکردووە کە لەسەر ڕێچکەو نەریتی شاعیرانی فورس شیعری ووتووە، ساڵی ١٠٥٦ز کۆچی کردووەو؛ لە هیندوستان لە سەردەمی **شاهجان** کە ئیمپراتۆری مەغۆلی بووە، ژیاوە. دانەر

(غوڵامی) پێم وایە ئەو شاعیرەو کۆی شاعیرەکانی دیکە وشەی سەگیان وەك ڕەمزێکی وەفاداری خۆیان بەرامبەر خۆشەویستەکەیان دانابێ‌و، لە وتنی ئەو وشەیەشدا هیچ مەبەست‌و واتایەکی بێڕێزیی خۆیان مەبەست نەبووبێت، ئەوەتا نالی گەورە لەو شاکارەیدا کە بۆ پێغەمبەری خۆشەویستی(د.خ) نووسیوە، زۆر بەزەقی ناوی سەگ دەهێنێ وەك دەڵێت ( نالی کە سەگی سەگی ئەو دەرو بوومەیە – ئەمما سەگێکی موعەللەمی بێ دەنگ‌و بێوەڕە) لێرەدا نالی خۆی بەسەگی سەگەکەی داوە لە قەڵەم نەك تەنها خودی سەگ، هەرچێ باسی ڕەمزەکانی دیکەشە وەك مەستوورەو حەبیبەو هەروەها باسی کەسێتی (ڕەقیب)و.. زۆر شتانی دیکە، من پێم وابێ کە زۆرێك لەوانە تەنها ڕەمزێك بێ‌و بەس، ئەگینا گەر بەهۆی ڕەمزەوە نەبێت؛ ئەوا شاعیر ناتوانێت هەست‌و سۆزی پڕ لەکەف‌و کوڵی شاعیرانەی خۆی وەدەرخات، بۆ نموونە: گەر منداڵێك پرسیارت لە بوونی خودا لێبکات، تۆ نەبێت بڵێیت: گیانەکەم بوونی خودا وەك بوونی ئەم مەساسەیەیە کە تۆدەیخۆیت، نەك بێیت‌و بڵێت ئەزیزم بچکۆلەکەم ئەو خودایەکی بەدەسەڵاتەو، ئەو واجیبو لووجوبەو، بێئەو هیچ ناکرێ‌و، دواتر بێیت باسی دەلیلی بورهان‌و باس‌و خواسی ئیمکانی وجودو بورهانی وجوودو، موقدیمەی سوغراو کوبراو نەتیجەی زانستی مەنتیق‌و موعارەزەی حەقیقی‌و مەجازی‌و مەعنەویی تا دەگاتە قیاسی ئیستسنانی‌و ... زۆرێك شت کە پەیوەندی بەزانستی ئاداب‌و مونازەرەوە هەیە، بۆیە دەبێت بەچەشنێك لەکۆی ئەو شیعرانەدا شتێك بکەیت بەڕەمز کەبتوانیت تەعبیرو لێکدانەوەی

شیعری لەسەر پیادە بکەیت، من ئەمە بۆچوونمە لەوانەشە هەڵە بم"[٦٣].
والله اعلم

شاعیرێکی دی لەشاعیرەکانی عەجەم دەفەرموێت: " **موحەممەدی عەرەبی(د.خ)ئەو کەسەیە کە گشت کەسێ لە دونیاو قیامەتدا هەر بەو شکۆمەندو موشەڕڕەف دەبیٚو، هەریەکێ رازی نەبێ ببێتە خۆڵی بەردەم کەوشکەنەکەی (عتبة) دەسا لووتی بەخۆڵاچێ**". بەم چەشنە شاعیریانو ئەدیبانو هۆنراوە نووسانو پەخشان هۆنەرانی عەجەم هەستو سۆزی عاریفانەی خۆیان بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) دەربڕیوەو، بەچەشنێکی گەلێ خاکیو بەکەمزانینەوە لەهەمبەر ئەو مەقامەدا ڕێزو شکۆیان داناوە، سەرباری ئەوەی ئەوان لەنووری پێغەمبەرایەتی(د.خ)دووربوونو بەهیچ کلۆجێ لە لانکەی ئیسلامو شوێنی دابەزینی نیگا نزیك نەبوون، بەڵام بەو زمانە سەیرو نامۆیەی (الرطانة)ی عەجەمییەشەوە هەستو کوڵی دڵیان لەهەمبەریدا (د.خ) ڕشتووە.

ئیدی خۆت بەراوردی ئەم هەستو سۆزە عەجەمییە بەو نووسینەی نووسەرو خوێندەوارە عەرەبە بکە؛ کە لەم نزیکانەداو لە شارێکی ئیسلامی مەزن کە بە تیردانو (کنانة) ڕووگەی ئیسلام دادەنرێو لە گۆڤارێکدا کە لە گەورەترینو پێشکەوتووترینو بەنێو بانگترینی زانکۆکانی جیهانی ئیسلام بەنێوبانگە کە ئەزهەری شەریفە

---

[٦٣] - *غوڵامی*

نووسیویەتی و، دەبێژێت:" لەڕاستیدا یەکێتی موحەممەدی بەچەشنی کۆلیژێکی گشتی وایە، لەبەر ئەوەی بەندە لەسەر عەقیدەو باوەڕێ کە هێندە ناخایەنێ لاواز دەبێ و گۆڕانی بەسەردا دێت، هەرچی یەکێتی چاکسازییەکەشیەتی وەك بەشێکی تایبەت وەهایە؛ چونکە بەندە لەسەر سوڵتان و دەسەلات، سوڵتانیش لەکۆتاییدا دووچاری لاوازی و سستی و پسان دەبێتەوەو، نامێنێت و لادەچێت. بەڵام یەکێتی ناسریی[٦٤] دەمێنێتەوەو بەردەوامیش لە گەشەدایە، لەبەرئەوەی ئەو یەکێتییە بەندە لەسەر سۆسیالیستی (الإشتراكية) لە ڕۆزیداو، ئازادیی لە ڕاو بۆچوون و، دیموکراتی لە حوکومدا، کەوابوو ئەم سێ بنەمایە گەرەنتییەکی جاویدانی و هەمیشەیی بەو یەکێتی و وەحدەیە دەبەخشێ"[١٧].

ئەری؛ کەسێ وشەی ئیسلام گۆییای بێ و، باوەڕی تەواوی بە پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ)هێنابێ و، دەمی بازدان و (نزوة) تێپەڕاندنی تەمەنی لاوێتی بەسەر بردبێ و، زمانیشی دووچاری هەڵنووتان (عثرة) بووبێتەوە؛ وەها قسەیەکی نابەجێ و تفت و هەڵیت و پەڵیت بێشەرم دەڵێت و بەم چەشنە هێرش دەکاتە سەر مەقامی پەیامبەران؟. لە وڵاتی ئێمە لەلای شێت و تەشقەڵەباز و (المستهتر) سەرخۆشەکانیشدا، وای لێهاتووە بووەتە نەریت کە هەرچەندە لە باروودۆخێکی وەهاداو لەسەرخۆشی قسەی هەڵیت و پەڵیت و شێتگیریدا بن، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز مەقامی پێغەمبەرایەتی نابەزێنن و ئەدەب نواندنیان لەهەمبەر

---

[٦٤] - مەبەستی " جەمال عەبدولناسر"ە. غولامی

ئەو زاتانەدا لە یاد ناچێت‌و، هەردەم کە ناویانهێنرا دەزانن بەچ چەشنێك قسە دەکەن، ئیدی هەرکەس بە لەونێ بێئەدبی بنوێنێ بەرامەبەریان ئەوا وەك ئەوە وایە قیامەت هەستابێ‌و تێکڕای ئەندامەکانی جەستەیان دەکەوێتە هەژان‌و خرۆشان‌و عەلاجەوییەوە.

ئەو چیرۆکە بۆ خوێنەری بەرێز دەخەمە ڕوو، کە ڕۆژنامەنووسێکی دیار دەربارەی شاعیرێکی مەزنی نیمچەکیشوەری هیندی دەیگێڕێتەوە، کە ئەو دەمە لە هەواو ئارەزووات‌و زەوقی لاوێتیدا سەرتۆپی شاعیران بووەو، هاوکات لەوانە بووە کە هەمیشە مەستن بەخواردنەوەی مەی‌و شەرابەوە، ئەویش شاعیری بەنێوبانگ **"ئەختەری ئەلشیرازی"**یە کە پێش چەن ساڵێك لەدونیا دەرچووە. مامۆستا **"شۆڕش ئەلکشمیری"**ی لە ڕۆژنامە گەرۆکەکەیدا کە لە لاهوری پاکستان بەنێوی ( چاتان) (Chatan)وە دەردەچێت.

دەڵێت:" دەفعەیەکیان دەستەیەك لە لاوان‌و شاعیران لە میوانخانەی (ئەلعەرەب)ی لاهوور کۆبوونەوە، لەنێویاندا کۆمەڵە لاوێکی شیوعیی زرنگ‌و زیرەك‌و قسەوێژی پیتۆڵ هەبوون، لەتەك**"ئەختەری ئەلشیرازی"**یدا کەوتنە کێشمەکێشی قسەو گفت‌وگۆو مشت‌ومڕو گەنگەشەی چەن بابەتێکەوەو قسەو باسی هەمەچەشنەیان دەکردو دەربارەی گەلێ شت دەدوان، **"مامۆستا ئەلشیرازی"**ی دوو پێك عارەقی خواردەوەو بەو هۆیەوە هزرو بیری لەدەستداو کەوتبووە نەشئەوە، تەزوو بەجەستەیدا دەهات‌و کەوتبووە قسەی هەلەق‌و مەلەق‌و ناتەواو،

یەکێك بوو لەوانەی زۆر سەرسام بوو بەخۆی‌و هەردەم بەشان‌و باڵی خۆیدا هەڵیدەداو، دانی بەخۆیدا نەبێ بە هیچ شاعیرێکی تردا نەدەنا".

چاك لەیادم نییە ئەو ڕۆژە باسی چ بابەتێکیان دەکرد، بەڵام ئەوەم بیرە کە دەیووت:" بەڕاستی لە نێو موسوڵمانان‌دا سێ کەڵە زاناو پیتۆڵ دەرکەوتوون، کە هەریەکە لە " **ئەبولفەزڵ**[٦٥]"و " **ئەسەدوڵڵای خان غالیب**[٦٦]"و "**ئەبولکەلام ئازاد**[٦٧]"ن[٦٨]، بەڵام هەرچی شاعیرانی هاوچەرخ هەیە، هیچیانی بەهاوکوفی خۆی نەدەزانی‌و ئەسڵەن هەر دانیشی پێدا نەدەنان، یەکێك لە لاوە شوعییەکان دەربارەی شاعیری گەورە "**فەیز ئەحمەد فەیز**" پرسیاری لێکرد، کەچی پشتی لە پرسیارەکەی کردو وەڵامی نەدایەوە، هەرچی دەربارەی شاعیری ناسراو

---

[٦٥]- لە وەزیرەکانی ئیمپراتۆر "**ئەکبەر**" بووەو. خاوەنی "**ئەکبەرنامە**"یە، کە بە شاکارێکی زانستی هەژمار دەکرێ‌و هاوکات یەکێکە لە پەرتووکە نەمرەکان لەمێژوو دەستووروو پلانی وڵاتاندا.

[٦٦]- شاعیرێکی "**ئۆردۆی**"یە، بەیەکێك لە کەڵە شاعیرانی وولاتی ئۆردۆ دادەنرێ‌و، دلرای فێرگەیەکی تایبەتە، لەسەدەی سیازدەیەمی کۆچیدا ژیاوە.

[٦٧]- زاناو ڕووناکبیرێکی ناسراو بووەو، سەرۆکاری کۆنگرەی هیندی نیشتمانی پێشوو و وەزیری پەروەردە (معارف) بووە لە کۆماری هینددا.

[٦٨]- بەهەمان چەشن وەك چۆن دەوترێت: سێ کوچکەی بابان لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لە ( **نالی‌و سالم‌و کوردی**) پێکهاتوون، بەهەمان شێوەش دەوترێت میسر خاوەنی سێ ئەهرامە کە لە ( **ئوموکەلسوم‌و عادیل ئیمام‌و موحەممەد حەسەنەن هەیکەل**) پێك هاتووە، وەك خۆم کەسێکی ترم بۆ زیاد کردووە کە ووتارووێژی بەنێوبانگ: " **عەبدولحەمیدی کوشك**"ە. *غوڵامی*

''**شەیبر حەسەن جۆش**''یشە پرسیاریان لێکرد، وتی شاعیر نییە؛ بەڵکو هۆنەرو بوێژە (ناظم)، ئیدی دەرهەق بەشاعیران‌و ئەدیبانی هاوچەرخ ڕاو بۆچوونی (بەسووك تەماشاکردن، یان لووتەلایی، یانەخۆ خەندە، یانەکو قۆشمەچێتی‌و گەپکردن بووە ''.

کە گەنجان زانیان بەهیچ شێوەیەك بەها بۆ بزاڤی ئەدەبی پێشکەوتوو دانانێ، یەکسەری پەنایان بردە بەر بابەتێکی دی، بەڵکو ئەمە خوایە نەختێ بیجوڵێن‌و هەنێ قسەی لێبێننە دەرێ، ووتیان: ئاغا، ڕات چییە دەربارەی فلانە پەیامبەر؟ چاوانی سوور بووبوویەوە، عەرەق چاوەکانی تەنی بوو، زمانی گۆی نەدەکرد؛ بەلام هاتەوە سەرخۆی‌و وتی:''بۆ هەڵیت‌و پەڵیت دەڵێن؟ تەنها دەربارەی ئەدەب‌و ئینشاو هۆنراوەو شاعیران بدوێن، جڵەوی قسەیان وەردایە ئەفلاتون‌و، وتیان: بۆچوونت دەربارەی وتووێژەکانی چییە؟ دواتر ئاگری قسەیان بەردایە ئەرستۆ و سوکرات، بۆ قسەکردن چالاك بوو، وتی: ئەوانە کۆمەڵێ بوون گوزەشتن؛ کە باسیان لە کەسایەتی‌و ئێستای ئێمەمانان کردووە، گەر ئەو فەیلەسوفانە لەم سەردەمەی ئێمەدا بوونایە دەبایە ببوونایە بە قووتابییمان. ئێمە چیمان داوە لەدەربڕینی ڕاو بۆچوون لەسەریان؟

یەکێك لە لاوە چالاکەکانی شوعیی ئەم چالاك‌و شادومانییەی بەهەلزانی‌و چاپووکانە ووتی: رات دەرهەق بە پێغەمبەری خودا(د.خ)چۆنە؟ هەر ئەوەندە خۆش بوو ئەم قسەیەی لەدەم هاتەدەر، ئیدی وەك ئەوەی هەورەتریشقە لێیدابێ‌و زریانێ بەرپابووبێ؛ گەنج قسەی تەواو نەکردو ''**ئەلشیرازی**'' سەرخۆش شووشە عەرەقەکەی

کێشا بەسەریاو وتی: "بێ ئەدەب! تۆ وەها لەوچەلەوچ‌و پرسیارێکی ناساز لە پیاوێکی تاوانبارو خەتاباری وەك من دەکەیت؟ دەتەوێ چ شتێ لە کەسێکی فاسقەوە ببیستی؟ لاشەی دەلەرزی، بەکوڵ دەستی کرد بە گریان ئەمما چ گریانێ، ڕووی کردە لاوە لەوچە لەوچکەرەکەو بەو پەڕی تووڕەیی‌و توندییەوە، وتی: ئەی پیس، هەی بێ ئەدەب، هۆ بێ شەرم، چۆن ڕێگەت بەخۆتدا ناوی زاتێکی وەها پاك‌و بێگەردو پیرۆز بهێنیت؟ یان چۆن چۆنی توانیت وەها قسەیەکت لەدەم بێتە دەر؟ بوارێکی زیاترت هەبوو تا قسەی لەسەر بکەیت، ئیدی بۆچی خۆت خستە نێو ئەم شەڕە پیرۆزەوە؟ لەم پرسیارە پڕوپووچانەت تەوبە بکە، من چاك شارەزای نیازی پیسی ئەنگۆم، بەتەواوی شەڕ لە ڕووخساریدا بەدیار کەوتبوو وەك ئەوەی بیەوێ ئەو گەنجە هەپروون هەپروون بکاو تارومارى بکات".

بەڵام ئەم لاوە هەروەك چۆن لەو کاتەدا عەقڵی ئامادەگی نەبوو، هاوکات تازەش کەوتۆتە داوی خۆیەوەو بەئاسانی لێی قوتار نابێت، هەرگیزیش چاوەڕێی وەها وەڵامێکی جەرگبڕو ناهومێدی نەدەکرد، ئەو لە شاعیردا هەستێکی شێر ئاسای بێدارکردەوەو، هاوکات تێکڕای ئەو پریشکە ئاگرین‌و، پزوسکی باوەڕو سۆزەو، ئەو شەرارەتە گەرم‌و بەغیرەتەی تێدا هەژاندەوە، ئەو وای دەزانی تەنها شاعیرێکی ئاساییەو گوێ بە ئارەزوات‌و ڕابواردنی دونیایی‌و غەزەل‌و غەرامیات نەبێ بەهیچی دیکە نادات، بەڵام پێچەوانە دەرچوو، زۆر هەوڵی دا کە سەرقاڵیکات بەشتێکی دیکەوەو هەندێ بیهێنێتەوە سەرخۆی‌و

هێووری بکاتەوە. بەڵام سەرکەوتوو نەبوو هەرچی کۆشا "ئەختەر" هێمن نەدەبوویەوە، فەرمانی کرد لە مەجلیسەکە بیکەنە دەرەوە، دواتر بەدرێژایی ئەو شەوەی بەگریان‌و ئاهو نزولەوە بردە سەرو دەیووت:" **ئەم گەنج‌و لاوانە وایان لێهاتووە بەو چەشنە لەهەمبەر پێغەمبەری خۆشەویستدا (د.خ) لەرچە لەرچ‌و ژاکبدەن، ئەوان نەیانەوێ ئەو خۆشەویستی‌و وەفاو دڵسۆزییەش بۆ ئەو سەرومرە (د.خ) هەمانەو ئەو تاکە شتەی کە هەردەم جێگەی شانازی‌و عیززەتی ئێمە بووە، نەمێنێت‌و لەنێو بچێت، خودایە من تاوانبارم‌و دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم، بەڵام ئەوانە نەیانەوێ ئەم گریێ بەمێژەی ئیسلام لەت‌و پەت کەن‌و بیکەنەوەو لە کۆشی ئیسلام بمانهێننە دەرەوە، نەخێر بەخودا هەرگیز بەشتی وەها رازی نابین**".

بەڵام -ئەی داوبێداد-زۆر بەداخەوە، چەندە مەودای نێوان ئەو وەفادارییە عەجەمی‌و پەرۆشە هیندیەو هاوکات ئەو غیرەتی ئیمانەی کە پریشکی ئاگری لێبەرزدەبێتەوە دوورە، کە هەڵقوڵاویی خەیاڵدانی شاعیرێکی عەجەمە، ئەو شاعیرەی نە لەنەوەی عەرەبەوە نە تەنها جارێکیش بەزمانی عەرەبی قسەی کردوە. ئەو بەئەندازەیەك لەو ژینگە عەرەبییەوە دوورە کە حسابی نییە، دوور لە ژینگەیەکی زانستی‌و ئایینی ئەزهەری شەریف ژیاوە، تەنانەت ئەو کەسێك بووە هەردەم لەنێو یانەی شەوانەوە کۆڕو مەجلیسی شەراب‌و عەرەقخواردنەوەو ناوەندی شیعرو ئەدەبدا کاتەکانی بەسەر بردووە، بەچەشنی شاعیرانی

وەك:" **عومەری کوڕی ئەبو ڕەبیعە"** و" **ئەبو نەواس"**و" **بەششاری کوڕی بورد"** بە بێئابڕوویی و قۆشمەچێتی لەشیعردا ناویان دەرکردبوو.

گومانی تێدانییەو بەڵگە نەویستە؛ کە مەودایەکی دوورو جوداوازییەکی زۆر لە نێوان ئەو و ڕوناکبیرێکی دیکەدا کە بەشیری زمانی عەرەبی و ئاداب و نەریتی ئیسلام گۆشکرابێ و، هاوکات بە نووسینی سیرەتی پێغەمبەرو(د.خ) باباتگەلە ئیسلامییەکان بەنێوبانگ بێ و سەرنووسەری گۆڤارێك بێ کە زمانحاڵی ئەزهەری شەریف بێ هەیە، کە وەك زاناو دانایەکی کامڵ و بیریارێکی مەزن تەماشاکرابێ.

چۆن ناوێك کە سەرتۆپەی کۆی ناوەکانەو مەزنترین و گەورەترین ناوە لە نێو موسوڵماناندا، لەتەك ناوی کاربەدەستێکی میسری وەك **"جەمال عەبدولناسردا"** بەراوورد دەکرێ، دواتر هێندە ناکەس و بێئەدەب بێت، فەزڵی ئەو بەسەر پێغەمبەری مرۆڤایەتیدا(د.خ)بداتو بڵێیت ئەو یەکگرتنەی ئەو باسی لێوەدەکات سەدقاتی ئەوەیە کە ئیسلام و پەیامەبەرکەی(د.خ)هێناویانە، ئای خۆزگە هەر لەدایك نەبوایەو، ئێمەش بڕای بڕ وەها شتێکمان نەبیستایە.

دواتر گەر بۆ جارێکیش بایە بمانبیستایە **جەمال عەبدولناسر** لەهەمبەر ئەم نووسینە شەرمەزارکەرەی جەنابی **ئەلزیاتدا** خورپەیەك یان خوتخوتەیەك بەدڵیدا هاتبێ و، یان خەوی لێزڕابێ و ژیانی تاڵ بووبێ، یانەخۆ کۆشکی حکومەتەکەی کەوتبێتە لەرزەو، موسوڵمانانیش لە

میسردا هاواریان لێبەرزببوایەتەوەو، تێکرای خەڵکی لە پەرمەی گریان دابێ و میسریش بەچەشنی تاقە پیاوێك پێکەوە هەستانایەتەوەو، هاوکات ئەو ویژدانەی گەلی میسر کە ناسراون بە غیرەتو چاپوکیان بۆ ئیسلامو خۆشەویستییەکی قوڵو لەڕادەبەدەریان بۆ پێغەمبەری ئازیز(د.خ)، بهەژێو بەجارێك بخرۆشێ، بەڵام زۆر بەداخەوە هیچێك لەوانە ڕوویان نەدا؟!! دوابەدوای دوومانگی دی بەسەر ئەو نووسینەی ئەلزیاتدا چاومان بە گۆڤارێکی میسریی دەکەوێت کە تێچوونی (تعليق) لەسەر ئەو ڕووداوە داوەو دەڵێت: (( والزيات وأمثاله بهذا النفاق المتبجّح الأحمق يؤذون الثورةَ، ويمكنون منها خصومَها والمتربصين بها)) واتە:" ئەلزیاتو هاوڕێنەکانی بەم کردارە دووڕوییو کاڵفامییە خۆهەڵکێشەیانەوە ئێشیان بە شۆڕش گەیاندووەو، ڕێگەخۆشدەکەن بۆ نەیاران کە هەردەم بۆ شۆڕش لە کەمینداین ".

لەپاش ئەم قسە هەڵیتو پەڵیتانە، زانایانی ئەزهەر چەندین بڕیارو بروسکەو کۆڕو کۆبوونەوەیان سازکردو، هەندێکیان چەن هەڵوێستێکی ئەرێنی واهایان نواند کە پێویستە دەستخۆشی لێبکرێو سوپاس بکرێ، کە شێخی ئەزهەری هێنایە سەرخەتو بەیاننامەیەکی دەرکردو بەدوایدا ئەلزیاتیش بە بەیاننامەیەك بەرپەچی دایەوە، چاومان بە هەردوو بەیاننامەکە نەکەوت، ئەوەندەبێ کە سەرنووسەری گۆڤارەکە تێچوونێکی لەسەر داوەو دەڵێت: ((لم يغنيا عنهما من الله شيئا))" هەردوو بەیاننامەکە بەردێکیان نەخستە سەر بەردێ". بەرپرسی گۆڤارەکە بە شیکارییو بەش بەش درێژە بەقسەکانی دەداو دێتە سەر

**گووتارەکەی ئەلزیات‌و دەڵێت:" ئەلزیات بەچەشنی خۆرهەڵاتناسان لەلایەك یەکێتی ئیسلامی بە نێوی یەکێتی موحەممەدییەوە ناو ناوەو، لەلایەکی دیکەوە بەراووردی ناوی موحەممەدو سەڵاح‌و ناسری لەتەك یەکەدا کردووە، ئەمەش بێنەدەبییەکە لە گەڵ خوداداو شایستەی لێخۆشبوون نییە".**

دواتر دێتە سەر ڕەخنەو توانج لە گووتارەکەو دەڵێت:" **ئەلزیات لەبیری چووە کە سەید ڕەئیس گەلێ بەرێزترو لەسەرو ئەوەیە کە خۆی دابەزێنێتە ئاستی ئەو کەسە ڕیسواو سووکانەی کەوا بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکەن، تەنانەت ئەو قەتحین ڕازی نابێت بە فەزڵدانی بەسەر پێغەمبەری خوادا (د.خ) ئەوە ئەو کەسانە خۆیان دابەزاندووە بۆ ئەو ئاستە نزمەی کە فەزڵی کەسێك بدەن بەسەر ئەو زاتەدا، یان زۆر لەوە گەورەترە کە بووترێ ئەو شتێکی هێناوە کە پێغەمبەری خودا نەیهێناوە".**

زۆر بەداخەوەو سەرمسوڕدەمێنێ، کە گۆڤارێکی ئیسلامی وەهاو سەرنووسەرەکەشی چەند پەرۆشی ئەدەب نواندن لە هەمبەر مەقامی سەید ڕەئیس‌و، بە چەشنێك بەشان‌و باڵیدا هەڵدەدەن کە هیچ پیاوێ بیری لێنەکردبێتەوەو بەخەیاڵیدا نەهاتبێ. لەبیریدەچێ کەبە ناوی (سەید ڕەئیس)ەوە باسی دەکات، لەکاتێکدا تێکڕای سیادەی پووچ‌و بەتاڵ لە بەرامبەر گەورەیی‌و سەییدی عەرەب‌و عەجەم‌و سەروەری مرۆڤایەتیدا دەبێت بەهەڵم‌و دەچێت بەهەوادا، ئەو گەورەییەی کە کۆی گەورەو پادشایانی جیهان بەشوێنیدا وێڵ‌و عەودالن‌و، هاوکات تێکڕای

گەورەو مەزنانی هەرچی ئوممەتی دونیا هەیە تاج‌و تەخت‌و کاپتنیان بەجێهێشت‌و بە ملکەچییەوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و (د.خ) دانیان نا بە مەقامی گەورەیی ئەو خۆشەویستە مەزنەدا (د.خ)، ئیدی چۆن نووسەرێکی وەها بسوڵمان جورئەت دەکا بەرگری -خۆی گووتەنی -لەوەها ئازادییەکی پیرۆز بکاو، پیاوێ بەهاوشانی گەورەی پێغەمبەراندا (د.خ) دابنێ، پێی بێژێ (سەید رەئیس)، سەرباری هەموو ئەوانەش بیکاتە ویردی سەر زمانی‌و بەشان‌و باڵیدا هەڵیداو بکەوێتە قسەی هەڵیت‌و پەڵیت؟!

ئەوی ڕاستی بێت دەبایە نوسەر لەم شوێنەدا کە مەقامی پێغەمبەرایەتییە(د.خ)هەموو شتێکی لە بیر خۆی ببردایەتەوە جگە لەم مەقامە ئەمرو سیادەتە جیهانیی‌و بەرێزو پڕحورمەتە نەبێت، سەرباری ئەوەش دەبایە بەرووی ئەوانەشدا بوەستایەتەوە کە بێئەدەبی بەو مەقامە مەزنە دەکەن‌و، هاوکات تێکڕای ئەو قسەو قسەلۆکانەی کە بەردە قسەهەڵبەستەکان‌و ڕۆژنامە ملکەچەکان لە نازناو گووتەی پووچ و بێمانا باسی لێوەئەکەن لەیاد کردبایە. ئیدی ئەوە ئەوپەری بێ زەوقییە کەلەسەر نووسەرێکی گەورەو زانایەکی ئایینی کە سەرنووسەری گۆڤارێك بێ ئێمە پلارو توانجی لێبگرین، هاوکات ئەوە بەرگرییەکی ئەوپەڕی لاوازییە کە بەرامبەر مەقامی پێغەمبەردا(د.خ)

ئەنجامان دابێ. بۆیە چاوەڕێی میسرین کە بەرپەچێکی گەورەترو شەریفتری لەوەی کردیوویەتی بنوێنێ[69].

ئێمە هەردەم چاوەڕێی زمانێکی لەوە بەهێزترو بەرگرییەکی بەغیرەترو بەسازترمان دەکرد، چاوەڕێبووین کەسێك لە میسرەدا بلێت: ئیدی بۆ شەرەفی ناسر بەسە کە دان بە گەورەیی موحەممەددا(د.خ)بنێتو، دەبایە کەسێکی وەك ناسر شانازیی بکردایە شوێنێکی لە ڕیزی بەندەو بەردە ڕاقییەکانی موحەممەددا(د.خ)چنگ بکەوێت، هاوکات قسەکەی بوێژایەو بیبێژایەو بیوتایە: ناسر گەر پشکێکی لەو خۆشبەختیو کامەرانییەی پێشەوا سەڵاحەددینی ئەییوبی کوردیی هەیبووە، ئەویش هەیبوایە ئیدی بەسی بوو.

هەی هاوار! ئەو میسرەی کە ژمارەی موسوڵمانەکانی لە ٩٠٪ کەمتر نییەو، ئەمێستاش ئیسلام ئایینی فەرمی ئەو وولاتەیە، ئەو شیرینی وەتەنییەتو حکومەتەشی چنگی کەوتووە تەنها لەفەزڵو گەورەیی ئەو ئازیزەوەیە (د.خ)، کە ئێستا وای لێهاتووە دووڕوویەك بێتو تای شایەنی حاکمێکی میسر بدات بەسەر تای گەورەی بەشەریەتدا (د.خ)،

---

[69] - بەڵام بەداخەوە ئەم نووسینەی ئەننەلوییو تەواوی نوسینەکانی دیکە، هیچ سوودێکی نەبوو، میسریش تەواوی جیهانی ئیسلامی لە خەوی گۆرستانیی جاویدانیاندا بۆ هەتا هەتایە مانەوەو نقەیان لێوە نەهات، بۆیە ئەم بەشەی کە دەمێکە نووسەر نووسیویەتی وەرمگێڕا بۆ ئەوەی کەسایەتی زانا کە وەها کردارێکی لەبەرامەبەر مەقامی پێغەمبەرایەتیدا نواندووە، بزانریو خەڵکی ئاگاردار بۆچوونو رەئییەکانی بن. غولامی

ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەو کەسە یەکێك بێ لە گەورە زانایانی ئەزهەرو، جێی متامانەی میسر بێو، لەسەر سفرەو خوانی ئەوان خۆی تێر کردبێ: کەچی لەم سەر هەتا ئەوسەری وڵات کەسێکت چنگ نەکەوێ دەنگێ بەرز بکاتەوەو بڵێت:" **خۆڵێ کە پای پێدادەنرێ لەکوێو هەسارەی سورەییا لەکوێ؟، گۆڕ لەکوێو گۆڕهەڵکەن لەکوێ؟، بڵقی سەر ئاو لەکوێو پێغەمبەرێکی ئەمر(د.خ)کە خۆری لێئاوانابێو بریسکی ئەستێرەی لێدوایی نایە لەکوێ؟.**

ئایا لە تێکرای میسردا مرۆیە نییە بەرهەڵستی ئەم قسە هەڵیتو پەڵیتانە ببێتەوەو قۆشقی (الغضب الشدید) بێتو، بەم هەڵەوەرەی کە بەراوورد لەنێوان سەرۆکایەتییەك دەکات کە مرۆڤ نازانێ چارەنووسی بەکوێ دەگاو، هاوکات لەنێوان سەرۆکێکدا کە خۆرهەڵاتو خۆرئاواو ڕابردو و ئێستاو داهاتووی ڕێکخستووەو، هەروەها بەراوورد دەکات لە نێوان یەککگرتوویيەك کە عەرەبو عەجەمو تێکڕای ئەو ئوممەتو گەلانەی کە چەندین سەدەیە تەژین لە شەڕو ئاڵۆزی کرد بەیەكو بەڕادەیەك برایەتییەکەیان زۆر لەبرای دایكو باوك بەهێترو بەگروتینتر بوو، بیژێت: ﴿ واذكروا نعمَتَ الله عليْكم إذْ كنْتم اعْداءً فألّفَ بيْنَ قلُوبكُمْ فأصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إخْوانًا﴾ ( آل عمران: ١٠٣). واتە: "**بیر لەو چاکە بکەنەوە کە خودا دەربارەی کردن: کە ئەنگۆ دژ بەیەکتر بوون، بە دڵ کردوونی بە هۆگر؛ ئەویش لەسایەی چاکەی ئەمەوە، ئەمێستا لێکتر بوونە برا**".

بەڵام زۆر بەداخەوە لەم سەردەمەدا و ڕابردووشی لەتەك بێت، چەندین کەس هاتوون‌و دەیانەوێ ئەو یەکێتییە نەبەوییە نەمرە بە یەکێتیی‌و یەککگرتوورییەکی لاوازو لەبارچوو وەسف بکەن و، هاوکات ئەو هەنگڵە توندەی(العروة الوثقى) کە پێکەوە بەستراوەو پسانی بۆ نییە بە یەکێتییەکی دروستکراوی وەها وەسف بکەن ؛ کە هەر خۆی بە کەلێنی‌و شێواوی لەدایك بووەو، بە بیماریش ژیاوەو، چەندین جاریش دووچاری گیانەڵا (الإحتضار) بووەتەوەو، هەردەم لە داروخانی خۆی ترساوە. وەك شاعیر دەفەرموێت:

كناطح صخرة يوماً ليوهنها فلم يضِرْها وأوهى قرنه الوعلُ[٧٠]

دەمەوێت دوابەدوای ئەو قسانەی کە ئەلزیات کردی‌و، بەچەشنێکی ناهەمواریش قسەی بەرامبەر پێغەمبەری ئازیز(د.خ)فڕەدا، هەمان ئەو هۆنراوەی ((بێخود))ی گەورەی پێ بڵێمەوە کە دەبێژێت:

**برا، خۆ تۆ لەلای خۆت مەخزەنی عەقڵ‌و کەماڵاتی!**

**کەچی تا دەوڵەمەنتر بی فەقیرو سواڵکەرو لاتی**

---

[٧٠] - واتە: ئیسلام بەچەشنی ئەو بەردە گەورەو بەهێزەیە؛ کە هەرچی لەتەکدا بکەیت هەر خۆت زیانت پێدەگاو، ئەلزیاتیش وەك ئەو بەرانە وەهایە کە سەری گیراندبێتە ئەو بەردەی -کە ئیسلامە- دواتر هەر شاخی خۆی دەشکێنێ‌و ئیسلام بەو مەزنیی‌و گەورەییە دەمێنێتەوە. غوڵامی

بە جامی خۆت مەنازە، ڕۆستەمی قابیز لە ڕێتایە

ئەگەر سەد شاهی (چین)یش بی، کشێکت هاتە بەر ماتی



## شاعیرانی عەجەم لە پەسنی فەخری عالەم ﷺ



یاداشتی هاوڕێی خۆشەویستم زەید بداتەوە؛ کە هونەر سازێکی گەلێ چاکە لە میواندارییکرنی چێژەکان و، هەژاندنی سۆزە کوژاوەکان و، بەهرە چەقبەستووەکان. بۆیە چەندین یانەی سازو ئامانە کرد کە تایبەتە بە خوێندنەوەی شیعرو ئەدەب و چڕینی چەندین بەیتە شیعری هەمە چەشن کە لەو هۆنراوە دێرینە ویژدانیانە پێکدێن کە دڵ و دەروون نەرم دەکاو ڕۆندك لەچاوان دێنێ و هەورە مادییە چڕەکان بڵاوەپێدەکاو ((إنقشاع))، خەڵکی لە جیهانێك کە ئازارو خەم و

خەفەت‌و ناهەمواری ژیان‌و ڕووبەڕووبوونەوەو کۆژان‌و دەست‌و پێوەندکردن‌و هەڵنووتانی بە کۆت‌وزەنجیریٚ کە بەسەریدا زاڵبووە ، بگوازێتەوە بۆ جیهانێك کە نەوازش‌و چێژو خۆشەویستی باڵی کێشاوە بەسەریداو، شنەی شەماڵی قودسی بەسەریاندا هەڵدەکا، ئیدی ئەو دەمە هەست بە ناسکی ڕۆح‌و، خۆشی دڵ‌و، پاکیزەیی دەروون‌و، هاوکات هەست بە چێژو نەرمی ژیان دەکەن‌و، دواتر ئەو شتەی لە پێش داهاتنی تێکڕای ئەم شتانە دۆزەخ بووە ئەمێستا بووە بە بەهەشت‌و، ئەوەشی کە قورس بووە ئێستا سووك‌و سادایە.

دوێنیٚ کۆڕێکی بۆ ئەو شاعیرانەی عەجەم کە خۆشەویستی دەنوێنن بۆ مەدینەو فەخری عالەم (د.خ) سازکرد، ئەوانەی کە شیعر بەباڵایدا (د.خ) هەڵدەدەن‌و، بەهۆیەوە بەهرەیان هەڵدەقوڵیٚ‌و، هەرچەند ئارەزوو بکەن سۆزو خۆشەویستی‌و باوەڕیان لەهەمبەریدا (د.خ) دەردەبڕن. گومانی تێدا نییە، لەلای ئەو کەسانەی کە پسپۆڕن‌و ئاگاداریان بەسەر ئەدەبی جیهانی ئیسلامییەوە هەیەو، لە تێکڕای کایەکانی زمانی ئەدەبی عەرەبییدا کۆڵینەوەو خوێندنەوەیان هەیەو، هاوکات لەو وڵاتەشی کە تێیدا دەژی‌و بەو زمانە قسە دەکریٚ‌و، بە کۆی هۆنراوەکانیشی بەهرەدەبەن‌و چێژی لێوەردەگرن، دەرکەوتووە کە؛ زمانی فارسیی دارای دەوڵەمەندترین سامانەو، هاوکات خۆشبەخترین پشکی لە مەدح‌و پەسنی پێغەمبەری خۆشەویستدا(د.خ) بەرکەوتووە، بەدوای ئەویشدا زمانی (ئۆردۆ) دێت کە لە ڕەگەزێکی فارسییە، ئەوەشی لە ئێران‌و هیند دەربارەی ئەو بابەتە وتراوە، ئەوا لەوانی دیکە لەڕووی

هێزو کاریگەریی‌و، نەرمی‌و پاراوییەوە جیاوازە، چونکە نەوازش‌و سۆزو هەستی نەرمی ڕۆحی تێدا پتر تر لەوانی دیکە نەماوە. لەڕاستیدا هەر ئەو شاعیرانەن کە چەندین واتاو خەیاڵیان داهێناوەو، چەندان لێکدانەوەو تەعبیریان هێناوەتە کایەوە کە پێشترو پاشتر نەبووە، بۆیە ئێستاشی لەتەك بێت زانایان‌و ئەدەب دۆستان‌و بیریاران سەرقاڵی وەچنگکەوتنی ئەو نهێنییەن کە لەم بابەتەدا هەیە.

هەندێك لەو بیریارو ئەدیبانە هۆکاری ئەم نهێنییە بۆ نارەزووی هیندیی‌و ئێرانی دەگێڕنەوە، کە پێیان وایە سرووشتی فارسەکان‌و هیندەکان سروشتێکی خۆشەویستی‌و سۆزداری هەڵکەوتووەو، زمانەکەشیان زمانی غەزەل[71] و دێوانەییە، بەڵام ئەو دەمەی تێکڕای ئەم وەسف‌و پەسەنانە ڕووی کردە کەسایەتییەك(د.خ)کە خودا بۆ خۆی کۆی شێوەی جوانی‌و ناسکی‌و قەشەنگی‌و، هاوکات دیمەنەکانی دولبەری‌و جەماڵ‌و کەماڵی پێبەخشیوە، ئیدی شتی زۆر سەرسوڕهێنەترو عەڵاجەوی تری بەدوای خۆیدا هێنا، کە لە تەك هێزی لێکدانەوەو جوانی وێناکردن‌و، نەوازشی خۆشەویستی‌و ڕێزو، سووتاوی دڵ و[72] ویژداندا ڕێدەکەوت، ئەو خودایەی کە بۆ خۆی

---

[71] - غەزەل: بەواتای دەستبازیی‌و چاوبازیی‌و ماچ‌ومووچیش دێت. غولامی

[72] - چەشنی ئەم وێناکردنەی دانەر، ((مەحوی)) گەورەش شعرێکی لەم بارەوە هەیە کە دەفەرمووێت:

وتم دڵی خۆت بەدڵی من بگۆڕە، گووتی
من بەردی بەقیمەت بە کەبابی نادەم.

مەدحی دەکاو لەلایەن خۆیەوە خۆشەویستی خستۆتە دڵیەوەو جوانترین پۆشاکی زاهیرو باتینی بەبەردا کردووەو کۆی هەستو نەوازشی لەهەمبەر مرۆڤایەتیدا پێبەخشیوە.

بەڵام هەندێکی تر هۆکارەکەی بۆ دوورە وڵاتیو ڕەوکردنەوە دەگەڕێننەوە، وەك نالی گەورەش لە شا بەیتەکەی دا فەرموویەتی:

**کەعبە ئیشراقی وەکو خورشیدە من چاووم زەعیف**

**لێم بووە مەعلووم کە بوعدی قوربە، قووربی بوعدە بۆم[٧٣]**

---

واتە: " بەیارم ووت دڵمان با بگۆڕینەوە، ووتی دڵی من وەك بەردی بەهادارو بەقیمەت وایە؛ نایدەم بەدڵێك کە وەك کەبابی لێهاتبیٚو سووتابیٚو کەڵکی نەمابێت". *غولامی*

[٧٣]- واتە: تیشك‌و ڕەنگدانەوەی تیشکی خۆری ناولازەی کەعبەیە هێندە بەخۆر دەچیٚ ناتوانم بەدی بکەم، وەك ئەوەی پیاوێك کە بەساڵاچووبێت گەر بیەویٚ تەماشای شتی بکات بەدەستی دووری دەخاتەوە لە چاوری بۆ ئەوەی جوانتر بیبینیٚ، دواتر نالی دەفەرمویٚ: من دەزانم کە تا لێیەوە نزیکبم هێندە گوناهبارم هەر لێی دوورم، تا لێشییەوە دوور بم هێندە خۆشەویستیو مەحەببەتم بۆی هەیە هەستدەکەم هەردەم لێی نزیکم، وەك ئەوەی نالی بڵیٚ من بڕوام بەوە نییە کەسیٚ بڵیٚ دووریم لە کەعبەو مەدینەوە وای کردووە کە ئەو مەحەبەتەم وەك ئەوانەی لێیەوە نزیکن هەڵنەقوڵیٚ، ئەو دەڵیٚ هەتا لێی دوور بم ئەوا زیاتر لێی نزیکم. *غولامی*

کە گومانی تێدا نییە ئەو دووانە کاریگەرییەکی سەرسوڕهێنەریان لە قوڵپەدانی کانیاوی دڵو خۆشەویستیو، سەرلەنوێ لەدایکبوونی واتا سەرسوڕهێنەرەکانو داگیرساندنی بەهرە شاراوەکاندا هەیە، لەڕاستیدا زۆرێك لەو شاعیرو بیریارانە دوور لە نیمچەدوورگەی عەرەبیو مەدینەی موونەوەرەوە ژیاوونو، لەسەردەمێکدا کە ململانێو شەڕو ئاژاوەو دوودڵیو دڵە خورتێی تێدا باو بووەو کە لەلایەن کەسانی ناقوڵاوە پیادەکراوە ژینیان بەسەر بردووە، بە ئەندازیەك زۆرێك لە کاروانی حاجیانی ئەو دەمە دووچاری دزینو ڕفاندن بوونەتەوە، ئیدی گەلێك ناڕەحەتو سەخت بووە کە بتوانن گەشتێکی وەها دووروودرێژ ئەنجامبدەن کە تەژییە لە ترسو بیمو تۆقان، بۆیە بە ووتنی هۆنراوەو لێکدانەوەی ئەو شیعرانەی کە سۆزو مەحەببەتو خۆشەویستیان دادەمرکێنێتەوە قەرەبووی ئەو گەشتە پڕ لە ترسناکییەیان کردۆتەوە، بۆیە ئەمێستاش شیعر تاکە پۆستەی دڵو سۆزە، شیعر چەشنی ئەو کۆترە سەرکردەیەیە کە هیچ شتێك خەفەتباری ناکاو هیچیش نابێتە لەمپەر لەبەردەمیدا.

هەرچی هەندێکی دیکەیە بۆ ئەو تەسەوفەی کە لە (ئێرانو هیند)دا بەربڵاوە دەیگەڕێننەوە، کە سەرباری ئەوەی -بەهەق یان ناهەق- زۆرێك لە ڕەخنەگران ڕەخنەی لێدەگرن، بەڵام هەر بە عاتیفەو خۆشەویستیو بەرەوپێدانو گەشەسەندنی دەناسرێ، درووستە بووترێ: کە بنەمای تەسەووفیش لە عاتیفەو خۆشەویستی پێکدێت، هەرکەسیش دارای پشکێك لەو دوو ڕۆزیەیە نەبێت، ئەوا بەدەگمەن ئەگینا سەرکەوتو و

سەرفەرازی بەختی نابێت. بێگومان ئەوەش ئەو تەسەوفە بوو کە لە زۆر قۆناغی ژیاندا هاوەڵایەتی (رافق) شیعرو ئەدەبی ئێرانی کردووەو، هاوکاتیش لە پێکهێنانو فراوانکردنو بەهێزکردنیدا بەشداربووەو، بووە بە سەرچاوەو سەرچەشمەی ئەو شیعرە غەزەلییە ناسکو ئەدەبە ویژدانییە قووڵە، ئیدی وەك دەووترێ جام کە لێوان بوو لێیدەڕژێو، دوای ئاودانیش سەرخۆشی دێو. دوای سەرخۆشیش سترانو گۆرانی چڕین دێتە ئاراوە، وەك ئەو شاعیرە عەرەبییە دێرینەی ئەم حەقیقەتەی لە دێڕێکی ڕەوانبێژیی‌و ناوازەدا دەربڕیوەو دەڵێت:

سقوني وقالوا: لاتغنّ ولو سقوا

جبال سليمى ما سقيت لغنّت

واتە: تێرئاویان کردمو مەستییان کردم دواتر ووتیان: نابێ گۆرانی بچڕیت، منیش ووتم نەك من تەنانەت، گەر تێکرای کێوەکانی (سولەیما)ش بەم چەشنە مەستکرابێو ئاوی خۆرادبێتەوەو مڕ بوو بێ، ئەوا هەر دەبایە گۆرانیان بچڕیبایە. من بەم چەشنە لە واتای شیعری شاعیر گەشتووم کە لەم شەرحەدا ووتوومە لەوانەشە کەسێکی تر باشتر لێی حاڵی بێو واتای ناوازەتر لەوەی کە من کردوومە بدات بەدەستەوە.

بەهەرحاڵ جێگەی بیرهێنانەوەیەو گومانی تێدا نییە شیعرو هۆنراوەی فارسیی –ئیدی ئەوەی لە ئێران یانەخۆ لە هیندستان– گوترا بێ، بوون بە زەخیرەیەکی گرنگی وەها کە چەندانی وەك من ببین بەقوتابیو

شتانی باشیان لێوە فێربین، بەڕادەیەك هێندیش لە داهێنانی مەدح و سەنای پێغەمبەری خۆشەویستدا. بە تەنیشت قوتابخانەی ئێرانی ڕەسەنەوە بوون بە فێرگەیەکی سەربەخۆ.

ئەو هاوڕێ بەڕێزەم سەرکەتووبوو لە بژاردەکردنی وەها بابەتێك لەم بەشەی شیعردا، ئەو یانە شیعرییەش کە سازی کردبوو، چەندین ئەدیب و شاعیرو هونەردۆستی مەزنی لە خۆگرتبوو، کە چەشکەیان لەشیعر دەبردو، لێیدەگەشتن و بەهیچ کلۆجێ پێویستیان بە وەرگێڕانی دەقە شیعرییەکان نەبوو، هەر لەناو ئەوانەدا چەند ڕووناکفیکرو شاعیرێکی عەرەبی لە خۆگرتبوو، سەرباری ئەوەی چێژیان لە مۆسیقای شیعری فارسیی و، جوانی ئاوازەکەیی و، ئاوازەیی ئەداکردنی دەبرد، بەڵام دەبایە دەقەکانیان بۆ وەرگێڕدرێ.

خانەخوێیەکە داوای لێکردم هەندێ لەو دەقە شیعرییە ناسکانە وەرگێڕم، ئەشمزانی کە کاری وەرگێڕانی شیعر بەتایبەتی و بەتایبەت تر شیعری فارسیی یان ئۆردی، لە سەختترین و ناڕەحەتترین کاری ئەدەبیی و وردترینیانە، چونکە هەموو زمانێك پێویستی بە کەشێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە تیایدا مرۆڤ بتوانێ لێکدانەوەی دەروونی ئەو کەشە بکا، ئیدی بەهیچ جۆری مرۆڤ ناتوانێ ئەو کەش و هەوایەی هەمان ئەو شیعرەی تەرجەمەی دەکات و، هاوکات ئەو زمانەش کە لە ڕووی کەش و، چێوەو (محیط)، هەرێم و، سروشت و، دەروونی نەوەکانیی و، دیرۆکی (تأریخ) ئەدەبەکەی، دەگرێتە خۆ، بگوازێتەوە.

شیعر زۆر لەو شووشەی کە خێرا دەشکێ‌و سەختیش چاکدەکرێتەوە، ناسکترو ووردترە، ئەو نهێنییە نەرمو ناسکەش کە دەقە شیعرییەکە لەڕووی کاریگەریی لە دەربڕین‌و شێوازو نمونەکان‌و پەیڕەوکردنیدا گرتۆتە ئەستۆ، ئەوا لە وەرگێڕانیدا نەك سەختە بەڵکو ئەستەمیشە، بۆیە منیان راسپارد کە چەند دەقێك لەو دەقە شیعرییانەی ئەو ڕۆژە لەو یانەدا گووترا وەرگێڕم، بۆ ئەوەی هەرچی شاعیرانی عەرەبیش هەیە لە هەست‌و سۆزو عەشقی عاریفانەی شاعیرانی فارس‌و ئۆردی بگەن، منیش هەوڵمدا ئەو هۆنراوانە بژاردە بکەم کە لەتەك زەوق‌و سەلیقەی شارستان‌و ژیاری عەرەبی یەکانگیر دەبێ، بۆیە بە سوپاسەوە بۆ ئەو کارە سەختە ڕێگەیان پێدام.

ئەو هاوڕێیەم کۆمەڵە شاعیرو ڕووناکبیرێکی هێنا بوو، بۆ ئەوەی بەهەمان سۆزو عەشق‌و خۆشەویستی‌و حوسنی تەماشاوە، چەپکێك لە شیعری ئەو کەڵە شاعیرانەی فارس‌و ئۆردۆ بەدەنگە بەسازو ئاوازە دڵپەزیرەکەیان بدەن بەگوێی ئامادەبواندا‌و بەیەکجار دەروونیان بهێننە جۆش‌و خرۆش‌و کەشێکی تەژی لە عیرفان‌و پڕ لە سۆزی ئەویندااران ساز بکەن.

یەکەمین کەسێ کە لەو یانەدا بە شیعرە ناوازەکانییەوە ناوی هێنرا **شێخی سەعدی**[٧٤] بوو، خاوەنی ئەو دوو پەرتووکە نەمرەکەی کە سەرمەشقی پەرتوکخانەی ئەدەبی جیهانین ئەویش " **گوڵستان‌و**

---

[٧٤] - ٦٩١ك وەفاتی کردووە.

بوستان"ە کەیەتی. کە ئێستاشی لەتەك بێت بە درێژایی مێژوو بەچەشنی دوو باخچەی ڕازاوە تەماشایان دەکرێ، ئەو شیعرەی کە دڵ کەوتە سەری و سۆزی عاریفانەش شەیدای بوو و بژاردەی منیش مژاری[٧٥] بوو، هۆنراوەیەکی گەلێك ئاسان و پاراو بوو، نموونەی سەهلول مومتەنیع[٧٦] بوو، وەك ئەوەی دەریایەك بڕژێنیتە جامۆڵکەیەکەوە، یان پەرتووکخانەیەك بخزێنرێتە دێڕێکەوە، کە دەڵێت: " **ئەو سێویەی[٧٧] کە بە نەخوێندەواریی گەورە بوو و وەك نەخوێندەوارێکیش ژیاو، قەتجێ لە کتێودا قورعانی نەخوێندوەتەوە؛ ئەوا توانی پەرتووکخانەی زۆرێك لە گەلانی دیکە بسڕێتەوەو، بەهاو زیندوێتیان نەهێڵێت، لەبارتەقاشدا کتێوخانەیەکی نوێ بونیادنا کە؛ بوو بە سەرچاوەی زانست و عیرفان و، سەرچەشمەی هەموو تینگێك**".

لەراستیدا ئەم هۆنراوەیە ئەو شۆڕشەی کە لەسەرڕوویی تێکرای شۆڕشەکانی کۆن و تازەیە لە جیهانی ئایینەکان و ئەخلاق و، زانست و داب و نەریت و، هاوکات ژیارو مەدەنییەت و، بەهاو چەمکەکاندا کورت کردۆتەوە. وەك ئەوەی بڵێت: دەبێت چۆن ئەم حەقیقەتە مەزنە لەسەردەستی نەخوێندەوارێك هاتبێتە بەرهەم، کە تەنانەت تاکە

---

[٧٥] - گفتوگۆ: قسەکردن دەربارەی شتێ. غولامی

[٧٦] – زۆر بیرم لە هاو واتای ئەم ووشەیە کردەوە بەڵام پێم باش بوو هەمان ووشە خۆی دانێمەوە؛ چونکە پێم وابوو ئەو وشانەی بۆ ماناکەی دانابوون کاڵ و کرچ بوون. غولامی

[٧٧] - واتە: منداڵی داك و باب مردوو. مامۆستا هەژار

ڕۆژێکیش لە مەجلیسی کتێبدا دانەنیشتووەو ئاشنا نەبووە بە چۆنییەتی پەرتووک‌و. لەژیانیدا ڕەشی نەخستۆتە سەر سپی، ئاخۆ نەبێت چۆن ئەم سەردەمە زانستییە نوێیە کە هیچ کەس ناتوانێت بیسرێتەوەو، هاوکات ئەم تەقینەوە زانستییەی کە هیچ کۆڵینەوەو پیشەسازییەك ناتوانێت پەردەی بەسەردا بدات‌و ڕاستەقینەکەی بشارێتەوە هەڵقوڵیوەو بۆ جاویدان ئاوی پاراوی پڕ لە ڕەونەقی بەخشیوەتە بنیادەم. تێکڕای ئەمانە ئەو نهێنییەیە کە باوەڕبوون بەتوانستی ئیلاهی نەبێت ناتوانرێ بەهیچ کلۆجێ پەیی پێببرێ‌و شیکار بکرێ، وە گەر ڕاستەوخۆو بەداهەت نەبوایەو، بینینی چاوانیش نەبایەو، هاوکات ئەو مێژووەش نەبوایە کە ڕاست‌و درووستییەکەی یەکلاییکردۆتەوەو بڕیویەتەیەوە، ئەوا ئەستەم بوو باوەڕپێکردنیی‌و ئیمانهێنان بەشانیدا.

دوای ئەو زاتە کە **شێخی سەعدییە** هاتە سەر باسی کەڵە پیاوێکی دی ئەویش **"فەرەدوددینی ئەلعەتتار"**ە، کە خاوەنی چەندین دیوان‌و پەرتووکی پڕ بایەخە لەوانە **"منطق الطير"**، کەوتە خوێندنەوەی چەند بەیتێکی ئەو زاتە گەورەیە، کە پاراویی‌و ناوازەی لێدەباری‌و، تەوبەو پەشیمانی‌و (الإنابة)، خاکێتیی‌و ترسان لەخوداو درکاندنی هەموو هەڵەو تاوان‌و کەمتەرخەمییەکانی تێدا پرشنگیدەدایەوە، لە تێکرای ئەو شیعرانەیدا دەپاڕایەوەو داوای دەکرد کە بە تکاو شەفاعەتی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) شاد بێت‌و، لە ڕۆژی حەشراو لەبەردەم

ئەو هەموو حەشاماتەدا خودا ئابرووی نەبا[78]، ئەوەی کە زۆرتر لەوانی دیکە دڵمی هەژاند ئەو وتەیەی بوو کە فەرمووبووی:" **ئەو تاکە حەقەی کە پێم براوەو هەقی خۆمە، ئەوەیە منیش ناوەکەم هەمان ئەو ناوەی ئەوە، گومانیشی تێدا نییە کە پیاوە سەخییو بەرزەکان ئەو منداڵانەی کە بەناوی ئەوانەوە نێونراوون لەبەرچاویانەو مافی خۆیانی پێدەبەخشن[79]**"

دوای ئەویش دێتە سەر شاعیری بەنێو بانگی هیندی ئەمیر " **خەسرەو[80]**" کە تێکڕای شاعیرانی ئێران ئالای سەرکردەو، پێشەواییان پێبەخشیوەو، وەك دیارترینی نەوەکانو شاعیرانی ئێرانیش شاهێدیی جوان خوێندنەوەو داهێنانیان لە شیعری فارسیدا بۆ داوە، شیعرەکەی

---

[78] - وەك ئەوەی ((مەحوی)) گەورە دەربارەی رۆژی حەشر دەفەرمووێت:

**بە ناخوون سورەتی یارم لە سەفحەی سینە نووسیووە**

**لە حەشرا وەقتی نەشری نامە کردن خۆمو سیپارەم**

**واتە**: من بەهەر پێنج پەنجەکەم وێنەی ئەڵلام لە سەر تەختی سینەم نوسیوەو دیاری کردووە، تا لە رۆژی حەشردا خودا لێی پرسیم کوا نامەکەت بڵێم: خودا یە ئەوە سینەمە کە ناوی تۆی لێنووسراوە. غوڵامی

[79] - ئەو ناوەی کە باوکی لێیناوە (**موحەممەد**)ەو بە (**فەرەدوددینی ئەلعەتتار**)ەوە ناوی دەرکردووەو پێی ناسراوە، ساڵی ٦٢٧ك وەفاتی فەرمووە. دانەر

[80] - ئەمیر خەسرەوە: لە پێشەوایانی هونەری موسیقاو ئاوازو ڕیتمو گۆرانییو بەیەکێك لەدامەزرێنەرانی هونەر لە هیند دادەنرێت، ساڵی ٧٢٥ك گیانی سپارد. دانەر

ئامادەبوانی بەئاگا هێنایەوەو گوێقوڵاخی بوون و، سەرسوڕمانی خۆیان لەهەمبەر ئەو جوانیی و ناوازەیی و قەشەنگ ئەداکردنەی داو، نەرمی دەنگیی و، هاوکات شیرینی زەنگی دەنگی تێکڕای جەستەیانی تەنی کردبوو، کە ئەمەی خوارەوە نموونەی چەن بەیتێکی ئەو شیعرانەیە:" **هەناسەو ئاکارە جوانەکانی سەرلەنوێ فوویی ژیانێکی دیکەی کرد بەبەری ئەو هەرمبانەی کە لەدەمی ئاوابوونی تەمەنی هەتاهەتاییاندا بوون، لەهەمان کاتدا ئەو ئاگرە بڵێسەدارەی ئەبو لەهەبیش[81] کە تەڕو وشکی پێکەو سوتاند کوژاندەوە، ئەو (د.خ) بە دوو هەنگاو توانی لەم جیهانەوە بکات بەو جیهانەی دیکەو[82]، لە گەڕێکیشدا (جولة) لەم جیهانە مادییەوە گەشت بە جیهانی ڕۆحیی**".

دوای ئەوان نۆبە هاتە سەر مەولانا " **عەبدولڕەحمانی ئەلجامیی**[83]" کە لە **مێژوودا بە مەزنترین سەناخوانی (المدیح) پێغەمبەری** خۆشەویست(د.خ)دادەنرێت، هەروەها لەزۆر کۆڕو مەجلیسی یادو زیکردا زۆرێك لە زانایان و دانایان و پیاوە بەرزەکان لە تێکڕای ئەو وڵاتانەی کە لەزمانی فارسیی دەگەن، شیعرو موناجاتی ئەو دەخوێننەوە، چەند بەیتێکی لەشاکاری قەسیدە جوانەکانی کە لەڕووی

---

[81]– مەبەست بەو وشەیەی " **ئەبولەهەب**" واتە: گەورەی بێباوەڕیی و نەزانیی، بۆیە لە ئەدەبی عەرەبیدا کەسایەتی " **ئەبولەهەب**" وەك ڕەمزو ئاماژەیەك بۆ ئەم ئاراستەیە دادەنرێت. دانەر

[82]– ئاماژەیە بۆ " **ئیسرلو میعراج**" شەو ڕەویی و بڵندبوونەوە. دانەر

[83]– ساڵی ٨٩٨ك جەستەی سپارد. دانەر

دەربڕینو لێکدانەوەوە سەرتۆپی کەڵە زانایانی زمانەوانی گرتبوو خوێندەوە، منیش ئەوەندەی توانیمو بۆم کرا هەندێکم لەو بەیتانە وەرگێڕا: "ئەی ئەو کەسەی ڕەچەڵەکت عەرەبییەو، نازناویشت نەخوێندەوارە، بەڕاستی تێکرای عەرەبو عەجەم پێکەوە دان بەخۆشەویستیو گەورەیی جەنابتا(د.خ)دەنێن؛ چونکە زمان پاراوییەکەت عەرەبی خرۆشاندو، ڕووخۆشییەکەت (ملاحة) دڵی تێکڕای عەجەمی داگرت، ئیدی چ عەیبەیەکی تێدایە کە نەدەزانی بخوێنیتەوەو نە دەتوانی بنووسیت؟، ئەوە نییە بە فەزڵی هەوڵو کۆششو هاتنت نەخوێندەوارەکان فێردەبنو، نەزانەکان دەبنە زاناو، هەر بەهۆی تۆوە لاپەڕەی کردەوەکانمان سەرلەنوێ سپی دەبێتەوەو، ڕوناکی تۆش گشت تاریکییەکان تارومار دەکاو تێکیان دەشکێنێ؟، ئیدی با هێڵێکی ڕەشیشت بەسەر سپییەکداو یان ڕەشت بەسەر ڕەشدا نەهێنابێ، ئەوانە هیچی گرنگ نییە".

بیسەران بەم هۆنراوە بەرزو ناسکە خرۆشانو لەرزین، جەستەیان بەم لاولادا وەك شنەی شەماڵ کەوتە جووڵە، بۆیە زۆریان پێشنیاریان کرد کە هۆنراوەیەکی عەرەبی کۆن بڵێتەوە؛ چونکە شێخ لە کەڵە زانایانی بواری ( نەحو و سەرف‌و ڕەوانبێژیو ئەدەب)بوو، بۆیە پێیان فەرموو:

و حدثتنا یاسعدُ عنهم فزدتَنا

شجوناً فزدنا من حدیثك یا سعدُ

واتە: ئەی سەعد – مەبەستی پێ ناوی کەسێکە نەك شێخی سەعدی، لێرەدا مەبەستەکە لە نێو ئەدەبی عەرەبیدایە– زۆر باس‌و خواسی ئەوانت کردو خەیاڵی دڵمان خرۆشاو شادبووین‌و شەووق‌و سۆز گرتینی، ئەسا توبی خودا بەردەوامبەو کۆڵ مەدە، با لەو کەش‌و هەوایەداو بەهەمان ئەو عیشق‌و ئەوینەی خۆمانەوە بمێنینەوە.

دواتر دوایان لێکرد باسی فەزڵی هاتن‌و بیعسەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و (د.خ) هاوکات باسی منەتی لەسەر تێکڕای جیهانی مرۆیی بکات، ئەوە بوو وتی:" ئاشکرایە پێش هاتنی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) کەعبە تەژیی بوو لە جۆرەها بتی لە بەردو دار دروستکراو، ئەو حەرەمە بەو پان‌و پۆڕییی‌و مەودا فراوانەیەوە جێگەی ئەوەی تێدا نەدەبوویەوە کە کەسێك خودای تێدا بپەرستێت، بەڵام ئەو هات‌و تێکڕای بتەکانی خست بە چۆکاو دوابڕاویی کردن‌و لەبن دەریهێنان‌و (واستأصل شأفتها)، فڕێیدانە زبڵدانی هەدەمەوە، هاوکات ئەوە ئەو بوو (د.خ) کە مەقامی ئیبراهیمی گەڕاندەوە شوێنی یەکەمجاریی‌و، ئەو نیازەی کە لە بونیادنانی بەیتو لحەرامدا هەیبوو بۆی هێنایە جی"[٣]. ئەم چەند دێرەی ئامادەبووانی هێنایە جۆش‌و خرۆشی وایانزانی ئێستا بەتێکڕا شەوق‌و سۆزیان بەرەو مەدینەکەی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) دەفڕێ، بۆیە هەر بەو سۆزەی جارانەوەو بەو ئەوینەوە لەبەردەم پێی خۆشەویستیداو لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری ئازیزدا (د.خ) وەستاو. جامۆڵکەیەك لەو هۆنراوەو شیعرە ناسك‌و جوانانەی دەکرد بەسەر ئەو هەست‌و سۆزەی کە لە ئاسۆکاندا

دەفڕیێو ڕێواری خۆی گرتبووە بەر، بۆیە پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کۆپلەیەك لەو قەسیدە شەوقییەیان بۆ بچڕێ، وەك ئەوەی پێشنیارەکەی ئەوانیش هاوڕای هەستو سۆزی بێ، بۆیە ڕۆحە مۆسیقییەکەی خرۆشاو، چەند ئاوازێکی خەمباری دووری یاری لێوە هاتەدەرێو وتی:

**" ئەو پەری دڵخۆشم کەبە دیدارت شاد بووم‌و گەشتمە مەدینە، بەوپەڕی شانازییەوە حەزمکەم لەپای ئەو سوپاسگوزاریی‌و دانئان بەو نیعمەتانەی بەهۆی جەنابتەوە(د.خ)دەستگیرمان بووە، بە پێڵو و گلێنەی چاوەکانم تۆزی ڕێگاکەت گسك بدەم‌و[84]، لە مزگەوتەکەتدا کڕنووشێکی سوپاسگوزاری بۆ زاتی پاکی خودا ببەم کە تۆی بە ڕەحمەت‌و نیعمەت بۆ ناردووین‌و، هاوکات ڕۆحم بکەم بە پەروانەو بە دەووری شەمع ئارایی تۆدا بفڕیێو[85]، فرمێسکی ئەو چاوانەم کە**

---

[84]- حەزرەتی نالی هەمان ئەو واتایەی لەدێرە شیعرێکیدا ئاماژە پێکردووەو دەفەرموویت:

بۆ تۆزی ڕەهت دیدە سەقاو موژە جارووب

ترسام لێم جێ بمێنێ بەری جێت بماڵم

واتە: بو تۆزی ڕێگاکەت ئەی یاری شیرینم چاوم هێندە فرمێسکی لێباری، بوو بەئاوپرژێنکاری بەری پێت‌و، برژانگەکانیشم بوون بە گسك، بەڵام بۆیە زۆر بەری پێتم نەدەماڵی دەترسام یەکێ لەو برژانگانەی چاوم بکەوێتە خولرەوەو بچێت بەپێتاو ئازارت پێبگەیەنێ. غولامی

[85]- ئەم دێرە دەتوانرێ بچوێنرێ بەو دێرەی(( مەحوی))یەوە کە دەفەرموێت:

زەمانێکە خەوی لێتۆراوە وەك هەوری بەهار بڕژێتە خوارەوەو، بەئاوەکەی گۆڕو کەوشکەنی ماڵەکەتی پێ ئاو بخواتەوە، دواتر هاتمە لای مینبەرەکەت و ڕووخسارم هێنا بە کۆڵەکەکانیداو، لە میحرابەکەیدا کڕنووشی شوکرم بۆ خودا بردو، شوێن پێی پیرۆزی جەنابیشتم(د.خ)یە خوێنی چاوم نەك بەفرمێسك شۆردو، پاشان لەبەردەم هەر کۆڵەکەیەکدا لەخودا دەپاڕامەوە کە مەقامی ئەو ڕاستگۆیانەم بەقسمەت بکات، ئەوانەی بەردەوام لەلای ئەم پایانەدا بەرپەری دڵسۆزیو وەجنەوە نوێژیان بۆ خودا ئەنجامداوە".

چەندین زانای پایە بڵند لە مەجلیسەکەدا هەبوون و، ئاوە ئاوە لەتەك گووتنی هەندێ بەیتە شیعردا سەریان بەرزدەکردەوەو، بەمۆڕی (شزراً) لە شاعیرو، بەسۆزو ئاگاهییەوە لە وەرگێڕ دەیانڕوانیی، وەك ئەوەی شاعیر شتانێکی نادرووستی ووتبێت، بۆیە پێمان وتن کە شاعیر لەکەڵە زانایانەو دارای باوەڕێکی درووستە، بەڵام ئەوەی باسی لێوەکرد زمانی شیعرو خۆشەویستییە نەك زمانی فیقهو کەلام، ئەوە زمانی مەجازو خوازەیە نەك حەقیقەت و قەزییە.

دواتر ڕۆڵی گەورە شاعیری ئێرانی کە یەکێکە لە پێشەوایانی غەزەل و قەسیدەو، لە شیعری فارسیشدا خاوەنی مەزهەبێکی نوێیە، ئەویش

---

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ رەنگت لەگوڵ چ بکا
کە جیلوەی گوڵ لەگوڵ شەندا نەبێ بولبول لە چڵ چ بکا
کە هەڵگیرسا لەنووری بادە شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە دڵ چ بکا

نازناوەکەی "**هورفیی (٩٩٩ك)**"یە دێتە پێشەوە، کە من پێشتر وەك شاعیرێکی کۆشکەکانو، سەناخواهی پادشایانو مامۆستای شاعیرانی سەردەمی خۆی ناسیبووم، بەڵام ئەمێستا کاتێتی کە بێتە سەر مەدحی پێغەمبەری نازدارو (د.خ) گەورەو پێشەواکەی، بەڵام لە مەقامی ریسالەتدا ئەدەبی نواندو لەو هەڵوێستەی کە هەم شیعری بۆ پادشایان وتوەو هەم بۆ پێغەمبەری نازداریش (د.خ) وتووە، پۆزشی هێنیاوەیەو، وتی: " **پیاو نابێ لەیەك کاتو ساتدا هەم شیعر بۆ پادشایانو هەمیش بۆ سەرداری پادشایان (د.خ)بڵێ، پێم وایە ئەوپەڕی بێئەدەبیو شەرمە مرۆڤ لەیەك کاتدا دوو مەدحو سەنای تێدا بکاتو، هاوکات دوو دەروونی نزیك لەیەکی هەبێ، دەروونێك لە پەسنی پادشاو مەلیکەکانداو ئەوی دی لە مەدحی گەورەی عەرەبو عەجەمدا (د.خ)**".

بۆیە بەشەرمیزانی لەو مەجلیسەی کە مەدحی پادشیانی تێدا کردووە پەسنی پێغەمبەری نازدار(د.خ)بکات، ئیدی مەجلیسەکە پۆزشەکەیان لەبەرچاوگرتو شیعرەکەیان بۆ بۆنەیەکی دی هەڵگرت.

دەگێڕنەوە کە شاعیری بەنێوبانگ (( **بورەصیی**)) هەرگیز شیعری بۆ پێغەمبەری خودا (د.خ) نەبێت، بۆ هیچ کەسێ نەنووسیوە، بۆیە ئەو دەمەی بەنیازی زیارەتی ئەو خۆشەویستە (د.خ) بەڕێدەکەوێت بەرەو مەدینەی مونەووەرە؛ لە ڕێگادا دەگاتە **بەدر** و خەوی لێدەکەوێت، لەم کاتەدا پێغەمبەری ئازیز (د.خ) دێتە خەویی‌و پێی دەفەرموێت: " ئەی **بورەصی** باوەڕکە گەر بێیتە مەدینە لەبەرت هەڵدەستم". چۆن دەبێ وەفادار نەبیم لەهەمبەر ئەو هەمگە هۆنراوەی کە بە باڵای مندا نووسیوتە

؟! ئیدی کاتێ خەبەری دەبێتەوە، نازانێ چی بکات، لە حەیبەت قسەی پێغەمبەری خودا (د.خ) کە فەرموویەتی لەبەرت هەڵدەستم، نەدەتوانێ بەرەو مەدینە هەنگاو بنێ و نە دەشتوانێ بگەڕێتەوە، چونکە بەخۆی دەڵێت:" ئەی **بوروصی** تۆ پەیمانت دا کە بچیتە زیارەتی ئەو (د.خ) ئێستا چلۆن دەبێ بگەڕێیتەوەو بە دیداری شاد نەبی" ؟! بۆیە هەر لەوێدا دەمێنێتەوە؛ تا گیانی بەرزو پیرۆزی دەردەچێت.[86]

لەنێوەندی تێکڕای شاعیرانی هینددا شاعیری گەورە "**غالیب**[87]" بۆ ئەوەی وەك ئەوانی دی جێنەمێنێ لەو کاروانە ناوازەیەو بەشدار بێت لەم کۆڕە ئیمانییە نوێیەدا، هەستایەوەو چەند بەیتە شیعرێکی ناسكو پاراو و سانای ئەدا کردو، شیعرەکانی هیچ زیادەڕەوییەکی لە مەدحو ناردنی ئەندێشەو نقوومکردنی وشەسازیی تێدا نەبوو، بۆیە یەکسەر کەوتە قسەو فەرمووی:" **لەژیانیدا پەنجەکانی (د.خ) پێنووسی نەگرتووە؛ بەڵام دێڕێکی نووسی کە پێنووسەکانی مێژوو دەستەوەسانن لە هەمبەریدا، هەرگیز پێیەکانی(د.خ)لە بیابانێکدا**

---

[86]- (( خودی ئەم قسەیەم دووجار لە دەمی د. سەباح بەرزنجییەوە بیستووە)). ***غوڵامی***

[87]- ناوی تەوایی " **ئەسەدوڵڵا خانی (غالیب)ی دەهلەویی**"ە و، یەکێکە لەبەنێوبانگرتین و خۆشەویسترینی شاعیرانی "**ئۆردۆ**" لە ساڵی ١٢٨٥ك. وەك ڕێزێك بۆ ئەو شاعیرە گەورەیە، هیند بە حکومەت و شەعبەوە یادی سەد ساڵەی کۆچکردنەکەی کردەوەو، هاوکات بە یەکێك لە شاعیرە فارسەکانیش هەژماردەکرێ. دانەر

**دانەناوە؛ کە دوای خۆی نەیکردبێ بە بەهەشت‌و باخچەیەکی سەوز. گوفتارە شیرینەکانی بێباوەڕێکی دەکردە موسوڵمان‌و زەندیقێکی دەکردە باوەڕدار، دونیای بەنووری ئایین ڕووناك کردەوە، باوەڕدارانیشی لە سزای ڕۆژی ڕەستاخێز ڕزگار کرد". بەندەکانی لە پەرستنی بتەکان ڕزگار کردو، دونیای ئاوەدان کردەوەو کردی بەیەك ماڵی ئیمان‌و باوەڕ، ئەو ماڵەی کە دڵی نەیاران‌و دەروونی دڵڕەقە توندڕۆکانی تواندەوە، پەڵگە دەریستە، کە ووردە بەردی کەوشکەنی ماڵەکەی ئاسنی دەتواندەوەو بەردی نەرم دەکردو لە بەرنوێژەکەشیدا (محراب) خۆی دەچەماندەوەو دڵیشی بە عەرشی پەروەرێنییەوە پەساردبوو(معلّق)".**

دوای ئەم شاعیرە ئێرانییە بێگەردانە، نۆبەی شاعیرێکی هیندی هاوچەرخە کە لەڕووی پاراویی زمان‌و وشەسازیی‌و جوانیی شێواوی دەربڕینەوە هیچی لەشاعیرانی ئێران کەمتر نییە، ئەو کەسەش " **ماموستا مەسعود عەلی ئەلمەحوی**"[88]یە، ئەم پیاوە مەزنە دەڵێت:" **لەبەر هاتنی پێغەمبەری نازدار (د.خ)، فیترەت پەردەی لەسەر ڕووخساری لاداو، جوانترین دیمەنی وەدەرخست‌و، خۆی وەك بەهاری دەم بەخەندە لێکردو، بەگوڵی ڕەنگاو ڕەنگ‌و گوڵاڵە سوورەو لالەی بەهارە چەشنی پۆشاکێ ڕووی زەمینی داپۆشی، ڕوانینی ئەو(د.خ)وەك**

[88]- لە گوندێکی تەنیش "**کەهنەو**" لە دایك بووەو، خۆی فێری زمانی فارسی کردووەو لە خانەی وەرگێڕانی (**حەیدەر ئاباد**)یش کاری کردووەو، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. دانەر

کیمیا کار دەکات و، بەیەك جار قوڕی سواڵەی بێ بەها دەکات بە زێڕێکی پوخت و پرشنگدار، ئەو سەییدە(د.خ)بەبێ سوپاو کەتیبە توانی ئەو کەسانەی کە لەدۆڵی سەرگەردانییدا گم ببوون بیان کات بەو پادشایەی کە حوکمی جیهان بکاو هاوکات بەو مامۆستایەی کە تەواوی مرۆڤایەتی فێربکەن".

ئەمێستا ڕۆڵی شاعیرانی "ئۆردۆ" کە ژمارەیان گەلێ زۆرە دێتە پێشەوە، ئەو دەمە لەنێو شاعیرانی ئۆردۆ و هینددا گۆرانی و قەسیدە چڕین و سەناخوانی و، سۆزو مەحەببەت و عیشق نواندن بۆ ئەو پێغەمبەرە نازدارە و(د.خ)مەدینەو مەرقەدەکەی باس و خواسی نێو تێکڕای شاعیران بوو، هەرچی گەلی هیندیشە پێکەوە و بەو پەڕی پەرۆشییەوە زایەڵەی ئەو دەنگەیان دەرتەوە و بەدەم سەدای تێکڕای ئەو دەنگانەشەوە لەتەك خەمەکانیاندا دڵی خۆیان دەدایەوە، ئەوان هەردەم بەهۆی خۆشەویستی و هێزی ڕۆحی و شەرەفمەندی پێغەمبەری نازدارەوە(د.خ)بەرهەڵستی سەرجەم ئەو تەوژمە نەتەوەییە توندرۆیە، یان نیشتمانییە مولحیدەیان کردووە، بەڕادەیەك تێکڕای بانگەشەکەرانی نەتەوەیی و نیشتمانی بەوە تۆمەتباریان دەکەن، کە ئەوان فەزڵی نیشتمانی ڕۆحیان بەسەر نیشتمانی جەستەداو، هێڵانەی ڕۆحیان بەسەر هێڵانەی لاشەیاندا داوە.

لەوێدا ئامادەبوان پێشنیاری ئەوەیان کرد بۆ شاعیرو سەناخوانی پێغەمبەری نازدار(د.خ)"**موحسین کاکوڕوی**[89]" کە کۆی ژیانی بۆ مەدحی پێغەمبەر(د.خ)تەرخان کردووەو، بەڕادەیەك دەوترێت: "هەرگیز بۆ پێغەمبەری نازدار(د.خ)نەبێ شیعری بۆ کەس نەنووسیوە، هاوکات پێی خۆش نەبووە بەو پێنووسەی مەدحی پێغەمبەری (د.خ) پێکردووە جارێکی دی مەدحی کەسێکی تری پێبکات". شاعیر دێتە مەیدان‌و دەکەوێتە پەسنکردنی ئەو شەوەی کە پێغەمبەری نازدار (د.خ) تێیدا شەوڕەوی کرد بۆ ئاسمانەکان‌و، هاوکات ئاسمان ئەوپەڕی شانازی پێبەخشرا کە گەورەو پێشەوایەکی لەو چەشنە(د.خ)بەرەو ئەو سەفەر بکاو خۆی بە هاتنی ئەو نازدارە(د.خ)موفەرك بکا، بۆیە هاتە سەر سەناخوانی‌و، فەرمووی:" ئەو دەمی لەو شەوەدا بە ئەو پەڕی خاکێتی‌و ئەدەبەوە بێداربوویەوە، لەناکاو ئەو نازدارە (د.خ) شتانێکی وەها سەراسیمەو هەڵاجەریی بەر دیدە کەوت کە دڵی مرۆڤ لە هەمبەریدا دەتوایەوە، هاوکات هەرگیز بەدڵی مرۆڤەکاندا نەدەهات ڕۆژ و ساڵ بەو چەشنە بەدوای یەکدا بێن‌و خوراو ژوور بینەوە، شەو خۆیشی شتێکی لەو چەشنەی بە بیردا نەدەهات، بەڵکە نەویستیشە ئەو شەوڕەوییەی کە زەوی پێ شەرمەزەند بوو، ئیدی با دوای ئەوەش زەوی بووبێ بە گەوهەرو زێڕ و ئیکسیر، ئەوا هەر بەخۆی هەست بەوە دەکات کە ئیتر بۆ جاویدان شتی وەها بەخۆیەوە نابینێت، کە ڕەحمەت‌و بەزەییەکانی خودا لەو شەوەدا پەیتا پەیتا چەشنی ئاورنگو

[89] - ۱۳۲۳ك وەفاتی کردووە.

**شەونم بەدوای یەکدا دەهاتن‌و زەمین‌و ئاسمان پێکەوە پەیوەست بوون".**

دواتر نۆرە هاتە سەر گەورەو سەرکردەی شیعری ئیسلامی نوێ شێخ "**ئەڵتاف حوسەین**" کە لە هۆنراوەکانیدا بە "**حاڵی**"[٩٠] ناسراوەو، خاوەنی ئەو هەڵبەستە ئیسلامیەیە؛ کە پاش شۆڕشی ١٨٥٧ز کاریگەری تەواویی لەسەر ڕاتەکاندنی هەستی موسوڵمانان‌و بێدارکردنەوەی پیاوەتی‌و جوامێریان (النخوة) هەبوو، مەردومێکی زۆر لە وڵاتدا پێشوازییەکی بێوێنەیان لە هۆنراوەکانی ئەم کەڵە شاعیرە دەکرد، هاوکات ئەو هۆنراوانەی کەلەم بۆنەیەدا دەیووتن، بە وێنایەکی ئاوازە بۆ داکەوتەی (الواقع) مێژوویی‌و دوورەپەرێزی لەزیادەڕەویی‌و شێوازی شاعیرانی عەجەم ناسراو بوو، بۆ نموونە لە پەسنی پێغەمبەری نازداردا(د.خ) دەفەرمووێت:" **ئەوە ئەو بوو (د.خ) کە لەنێوەندی تێکرای پێغەمبەراندا بە (رحمة للعالمین) ناسراو بوو، چونکە نەریتی ئەو زاتە وابوو کە هەمیشە بەدەم پێویستیی هەژاران‌و نەدارانەوە بوو، هەردەم ئارەزووە شاراوەکانی دەهێنانە جیٚ‌و، ئەو ئازارو خەمانەی کە دوژمنان باراندبووی بەسەریاندا دەیڕەواندەوەو، دوورو نزیك لە خەم‌و چەرمەسەریی‌و دەردەسەرییەکانیاندا هاوبەشی دەکردن، بەڕادەیەك بە ئازارەکانیان ئازاری دەچەشت‌و بە خۆشییەکانیشیان خۆشبەخت دەبوو، ئەو پەناگەی هەژاران بوو، مەنزڵگەی لاوازەکان بوو، سەرپەرشتیاری بێنەوایان‌و بێباوکان بوو، پەروەردەکاری بەردەو**

---

[٩٠] - ١٣٣٣ك وەفاتی کردوە.

کۆیلەکان بوو، لە هەڵەکان خۆش دەبوو، چاکەی لەتەک ئەو کەسە دەکرد کە خراپەی لەگەڵ کردووە، ئەوەی خەڵکی خراپیان کردبوو ئەو چاکی دەکردەوە، هۆزو تیرە پەرت و پەش و بڵاوەکانی یەکخستەوە، هۆگری خستە نێوان دڵە تۆراوەکان.

ئەو دەمەی لە غاری حیرا هاتە خوارەوە لە ئاسمانەوە ئەو ئیکسیرەی هێنابوو کە خۆڵی دەگۆڕی بەزێڕو، بەردی بە گەوهەر دەکرد ، ڕۆیی بەرەو ئەو ئوممەتە عەرەبییەی کە چەندان سەدە بوو نەزانی باڵی کێشا بوو بەسەریداو، شۆڕشێکی ڕیشەیی تێدا ئەنجامدا، کە هەم ڕەوشەکەی گۆڕی و هەمیش ڕێچکەی مێژووی بۆ جاویدان هەڵگەڕاندەوە، لەڕاستیدا هەیامێك بوو ئەم کانزا بەنرخە لە ژێر خۆڵدا نێژرابوو (مطموراً) و کەوتبووە بن کەڵەکە بەردی (رکام) نەزانییەوەو، هیچ کەس بەهاو نرخی نەدەزانی. ئیدی ئەو دەمەی ئەم نازدارە هات (د.خ) تێکڕای شتەکانی گۆڕی، فووی ڕەحمەتی بە بوونەوەردا کرد، کۆی شتەکانی بە گەوهەرو زێڕو زیو کرد، بەڕادەیەك ئەو بەردەی کە گشت وەستایەك فڕێی دەداو هەموو تەلار سازێك فەرامۆشی دەکرد، ئەم بەدەستە پیرۆزو موفەڕکەکانی هێنایی و کردی بە بەردی گۆشەکان.

لەناکاو هەورێك لە چەمی (بطحاء) مەککەوە هاوردی چاو و گوێی زەمەنی پڕ کردو، گرمەو بروسکەی ئەم سەرو ئەو سەری خۆرئاواو خۆرهەڵاتی گرتەوە، ئیدی دەمێك بەسەر ڕووباری "تاجە" لە ئیسپانیادا ئەیشریقاندو، دەمێکیش بارانی ڕەحمەتی بەسەر ڕووباری "کەنج" لە کیشوەری هیندستاندا دەباراندو دەیدەماند، بارانەکەی

**تێکڕای باخچە وشك‌و بڕنگەکانی ئیسپانیای ژیاندەوەو، چاکەی بەسەر وشکانیی‌و دەریاکانیدا پرژاند، ئیدی هەرچی لەم جیهانەدا لە تێرناویی‌و جوانیی‌و قەشەنگیی‌و ناوازەیی‌و سەناو ڕوناکیی‌و شەونمی بەرەبەیان‌و گوڵاویی(رحیق) سەر تەختی کوڵمی گوڵ‌و لالەکان نەبینی، تێکڕایان بۆ فەزڵ‌و گەورەیی‌و هاتنی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویست‌و نازدارە دەگەڕێنەوە".**

ئیتر دوای ئەم هەمووە شاعیرو هۆنراوە چییانەی کە گەر بە دێڕە شیعرێکیش بێ سۆزو هەست‌و خۆشەویستیان بۆ خۆشەویستی خودا دەربڕیوە، ئیدی سەرە هاتە سەر "**موحەممەد ئیقبال**"ی گەورە شاعیر، ئەو ئانەی ناوەکەی خوێندرایەوە تێکرای خەڵکی سەریان بەرز کردەوەو ملیان درێژ کرد، مەجلیسەکە شەپۆلێکی جوڵانەوەو جقاتی تێکەوت، دواتر خانەخوێی بەڕێز هەستایە سەر پێ‌و هەستی کرد کە مەجلیسەکە زۆر لەوە زیاتری خایاندو، وتی: بەرێزان ئەوەی کە بیستان‌و چێژتان لێوەرگرت با بەس بێت، بەڵام مەجلیسێکی دیکەی تایبەتمان بۆ ئەم شاعیرە گەورەیە ئامادەکردووەو، تەنها شیعری ئەو نەبێ هیچ کەسی دی بۆی نییە بەشداری بکات، بۆیە هەموان ڕەزامەند بوون و هەستانەوەو، لەخۆشیدا زمانیان گۆی نەدەکردو ڕووخساریان خۆشبەختی‌و کامەرانی لێدەباری.

هاوڕێکەم کە پەیمانی دابوو کۆڕێکی تایبەت بۆ شیعرەکانی **موحەممەد ئیقباڵ** کە تێیدا سەناخوان‌و موناجات لەتەك پێغەمبەری خۆشەویست لەجیهانی خەیاڵدا ئەنجامبدات وەعدەکەی هێنایە جێ‌و، دواتر یەکێك

لە ڕووناكبیران كە توێژینەوەیەكی تایبەتو كۆڵینەوەیەكی قوڵی دەربارەی **ئیقبالّ** كردبوو هەستایە سەر پێ‌و ئەم گوتارەی خوارەوەی خوێندەوە:

**" لەڕاستیدا ئەو هۆكارە بنەرەتیی‌و دیارانەی كە تێكڕای فەزڵ‌و گەورەییەكەی بۆ دروستبوونی كەسایەتی‌و فەیلەسوفی گەورەمان موحەممەد ئیقبالّ دەگەڕێتەوە‌و، هاوكات ئەو خۆگرتنەوەی لەبەردەم كۆی ئەو ماددانەی كە مرۆڤ بەرەو كەناری لادان‌و تەوژمی ژیاری خۆرئاوا دەبات، تێكڕای فەزڵەكەی بۆ ئەو پەیوەندییە ڕۆحیی‌و خۆشەویستییە قوڵەی ئیقبالّ بۆ پێغەمبەری خۆشەویست دەگەڕێتەوە، كە گومانی تێدا نییە خۆشەویستی چاكترین پەردەو پاسەوانی دڵە، كە هەر دڵێكی داگرت‌و سەرقاڵی كرد بەخۆیەوە، ئەوا هەرگیز ناهێڵێت كەسانی دی دەستی تێوەردەن بیكەنە پەڕێك بەدەم باوە، یان كاڵتە چییان‌و قۆشمەگەران كاڵتەو گەپی پێوە بكەن، وەك خۆی دەڵێت: ((بروسكەو بەرقی زانستە خۆرئاواییەكان بۆ ساتێكیش نەیان توانی سەرسامم بكەن‌و، چاوی دڵم ببوژێننەوە؛ لەبەر ئەوەی من بە سوورمەی مەدینە چاوانم كل ڕێژ كردووە، زیاد لەوەش من ساڵەهای ساڵ بوو لەنێوەندی پەروەردەو فێركردنی خۆرئاوادا مامەوە، بەڵام سوپاس بۆ خودا بەچەشنی دەرچوونی ئیبراهیم‌ﷺ لە ئاگریی نەمروود، دەربازم بوو)).**

**ئیقباڵی** گەورە درێژە بەقسەكانی دەدات‌و دەڵێت: **"ئێستاشی لەتەك بێت فیرعەونەكانی ئەم چەرخە هەردەم لەكەمیندان بۆم، بەڵام**

**لەبەرئەوەی هەڵگری یەدی بەیزام ئەوا هەرگیز لێیان ناترسم، چونکە ئەو پیاوەی کە ڕۆژیی خۆشەویستییەکی ڕاستگۆیانە بێ ئەوا هەم خۆی دەناسێ‌و، هەم کەرامەتی دەپارێزێ‌و، بەهیچ کلۆجێکیش پێویستی بە پادشایان‌و مەلیکەکان نابێت، سەرتان سووڕنەمێنێ یان هەلاجەریتان لێنەیە گەر ئەستێرەکان بکرێنە نێچیرو، ناڕەحەتییەکان ملکەچم بن، چونکە من غوڵامی ئەو پێغەمبەرە گەورەیەم کە تەنانەت چەر و زیخەکانیش بە قوبلەکردنی پێیەکانی شەرەفمەند بوون، بە چەشنێ لە ئەستێرەکانی ئاسمان ڕێزو قەدری بەرزتر بوو، هاوکات خۆڵی شوێن پێیەکانیشی لە عەتر و عەبیر بۆنی خۆشتر بوو".**

لەپەرتووکی نهێنییەکانی خودیی (اسرار خودي)دا، شاعیر باسی بنەماکانی ژیانی ئوممەتی ئیسلامیی‌و ئەو کۆڵەکانی لەسەری وەستاوە دەکات. دواتر دێتە سەر باسی ئەو پەیوەندییە جاویدانیی‌و خۆ گەلاڵەکردنەی بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خۆشەویستەوە هەیەتی‌و فەنابووە لە خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرەدا. بەلام ئەو دەمەی دێتە سەر باس‌و خواسی پێغەمبەری خۆشەویست ئەوا زمانی دێتەگۆو دەکەوێتە سەر سکەی حەقیقی خۆیی‌و، لەڕێی باسی ئاکارو ئەخلاقییەوە بە هەناسەی سۆزو هەستی قوڵ‌و ئەوینەوە، چەند بەیتێك دەچڕێ کە ئێستاشی لەتەك بێت بە جوانترین سەناخوانی ئەبەویی‌و شیعری ویژدانی هەژمار دەکرێ‌و. دەڵێت:" **بێگومان دڵی موسوڵمان بە خۆشەویستی پێغەمبەری ئازیز(د.خ) کە بنەمای شەرەفمەندیی‌و سەرچاوەی شانازی ئەم جیهانەیە، ئاوەدانە، ئەو پێغەمبەرەی کە**

ئوممەتەکەی تاجی کیسرای نایە ژێر پێی، زەمانێك بوو لەسەر حەسیر شەویان دەکردەوە. ئەو شاهی ئەنبیایەی کە وای لەبەندەو بەردەستەکانی کرد لەسەر تەختی شاهانە بخەون، لە کاتێکدا خۆی چەندین شەویی بە وەنەوزەوە بردبووە سەر و بێ ئەوەی کل لەچاوانی بکات. چەندین شەویشی لە غاری حیرا بردە سەر تا دواجار ئوممەتێکی بونیاد ناو، دەستوورێکی نوسییەوەو، دەوڵەتێکی دامەزراند، ئەو دەمەش بەدەم دادو فوغانو نزولەوەو بەنوێژی پڕ کڕنووشەوە دەچووە بەر بارەگاهی خوداو چاوانی لە عەسر قەتیس دەبوو، ئەو ساتەشی کەلە بەرەی جەنگ بایە شمشێرەکەی خوێنی لێدەتکا.

-داكو بابم بە قوربانی بێ- ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی، کە هەرگیز مرۆڤایەتی کەسێکی وەها لە ناهێنێتە بوونەوەو، منداڵدانی مێژووش دوای ئەو بۆ هەتایە نەزۆك بوو بەوەی جارێکی دی کەسێکی چەشنی وی بەسکیدا بهێنێت، ئیدی ئەو هاتو بە کلیلی ئایین تێکڕای کەلوێرەکانی دونیای کردەوەو، لە جیهاندا دەرگای گەڕێکی(دورة) نوێی والا کردو، بەرەبەیانێکی تازەی هەڵێنا، لە کن ئەو پلە بەرزو پلە نزم، هەژارو دەوڵەمەن، ساغو ناساغ، پیرو لاو، ژنو پیاو وەك یەك بوون، لەتەك مەوالیەکانی لەسەر یەك خوان نانی دەخوارد. ئەو دەمەی "کیژەکەی حاتەمی تائیان" بە دەستو پێ بەستراوییو شەرمەزارییو سەرنەویدییەوە هێنایە لای، پێغەمبەری ئازیز(د.خ) شەرمی کردو عەباکەی خۆیی بۆ ڕاخست هەتا لەسەر زەوییەکە ڕۆنەنیشێ. ئێمە زۆر لەو ئافرەتە تائییە ڕووتو رەجاڵترین، ئێمە لەبەردەم ئوممەتانو

خەڵکانی دونیادا ڕووتین، ئەوەیە ڕێزو قەدری ئافرەتان لای ئەم نازدارە، ئەو کاتەی خەڵکی لەوپەڕی بێدەسەلاتیدایە، ئەو دوندی دەسەلات‌و شکۆیان پێدەبەخشێ، بۆئەوەی ساتێك چییە هەستی نامرۆیانە بە خەیاڵدانیاندا نەیەت، نەرمیی‌و تووڕەییەکەشی هەر ڕەحمەت بوو، ئەمە لەهەمبەر نەیارانی، ئیدی چ جای خۆشەویستان‌و دلارانی، ئەو قاپیی ڕەحمەتی لە دوژمنانی کردەوەو فەرمووی: ئەمڕۆ هیچ کەس بۆی نییە سەرخاتەسەرتان (تثریب). ئیدی بۆ ئێمەیەك کە هەریەکەمان خەڵکی (( حیجازو چین‌وماچین‌و ئێران‌و ولاتانی دیکەی جودا جوداین، لەچاو سۆزو چاکەی ئەودا تنۆکین لە دەریا، خاڵێکین لە پەرتوکێك، دێڕێکین لە کتێوخانەیەك، ئێمەیەك کە چەندان گوڵی لەهەژمار نەهاتووین‌و لەبەرامبەردا دارای یەك بۆن‌و بەرامین! بۆ نەبێت خۆشمان نەوێت؟ بەداك‌و بابەوە خۆمانی قوربان نەکەین؟ بۆ سۆزی ئەوین‌و کڵپەی دەروونمانی بۆ دەرنەبڕین؟ لە کاتێکا ئێمە مرۆڤین، ئەدی لەیادتان چوو لە تاو دووری پێغەمبەری ئازیز گیانداران بۆی دەگریان‌و، کۆڵەکەی مزگەوت سۆزو ئەوینی بۆ دەڕشت، باوەڕم پێبکەن لەلام خۆڵی مەدینە خۆشەویستترە لە هەرچی لەم ژیانەدا هەیە، ئای دەبێ چ نێعمەتگەلێ بەسەر ئەو شارەدا داباری کە جەستەی ئەو نازدارەی تێدا نێژراوە!! پێشەوا مالیك هەردەم لێیان دەپرسی بۆچ بە پێڵاوەوە نایەیتە مەدینە؟ دەیفەرموو: شەرم دەکەم پێ بەسەر خۆڵێکدا بنێم کە لاشەی پیرۆزی پێغەمبەری (د.خ) لەخۆ گرتبێت. بەڵێ: ئەوان بەم چەشنە ڕێزو حورمەتیان لەو پێغەمبەری ئازیز (د.خ) دەگرت، دەیانزانی لەتەك کێ مامەڵە دەکەن.

**ئیقبال** هەتا بەتەمەندا چووبا پترتر ئەوینی بۆ پێغەمبەری ئازیز کوڵی دەداو تاسەی دەکرد، بۆیە تەنانەت ئەودەمەی گەشتبووە لێواری گۆڕ و وورده وورده لە مەرگ نزیك دەبوویەوە لەڕادەبەدەر یادو بیری لای ئەویندارەکەی بوو، هەرجار لە مەجلیسی ئەودا باسی پێغەمبەر(د.خ) کرابایە، پاتەوپات دەستی دەکرد بەگریان‌و فرمێسك بەچاوانیا فوارەی دەکرد، واتدەزانی تازە خۆشەویسترین‌و چاکترین کەسی لە دونیا دەرچووە، بۆیە تێکرای ئەم ئەوین‌و خۆشەویستە قوڵەی وای لێدەکرد زۆر جار هۆنراوەو پەخشانی ئاوازەی بۆ بێت، جارێك لەتەك خوادا دەکەوێتە بەم شێوەیە دەپەیڤێت:" **پەروەردگارا تۆ هیچ پێویستییەکت بەخەڵکی نییەو، ئەمنیش بەندەیەکی هەژارم، لەڕۆژی حەشرا وەقتی نەشری نامەکردن بەڵگەو بیانووم قەبوڵ بفەرموو، ئەی خودایە تکات لێدەکەم بە تکای پێغەمبەر(د.خ) دادگاییم بکە، چۆن من بە کۆڵی گوناهو تاوانەوە، شەرم نەکەم بڵێم: من لە زومرەی ئەوم (د.خ) یان خەجاڵەتی دامەدمگری کە لەئوممەتی ئەو بم**[٩١]". وەك ئەوەی ((مەحوی)) گەورە دەفەرموێت:

**غەمی قاتیلمە ((مەحوی)) مونفەعیل، ما**

**لەرۆژی حەشرا کفنی خوێناویی بە بەر چووم**

---

[٩١] - بۆیە پێشەوا (( ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)) هەردەم دەیفەرموو:" **پەروەردگارا، گەر تێکرای ئەو چاکانەی لە دونیا کردوومە، بۆم حساب ناکەیت، ئەوا لە قیامەتا نەیدەی بەرووماو بڵێیت بۆ ڕیا کردووتە**". ئەی قوور بەسەر ئێمە، ئەو لەکوێو ئێمە لەکوێ!!. (*غوڵامی*)

واتە: ئەو منی کوشتووە، کەچی من خەممە کاتیّ کفنی خوێناویم دەبینیّ. کە بە تیری ئەو کوژراوم‌و لەخوێنا چنراووم، شەرم بکات. بۆیە مەحوی دەفەرمووێت: حەزناکەم شەرم بکات کە منی کوشتووە، دەبێت من شانازی بکەم کە بەتیری ئەو کوژراوم نەك بەتیری ڕەقیب.

**موحەممەد ئیقبال** زۆر پشتی بەم بڕوایەی قاییم بوو، لەزۆر ڕووداوی ژیانیدا پشتی پێدەبەست. ئەو پێی وابوو ئەوە هێزو تایبەتمەندیی‌و زەخیرەو سامانەکەیەتی، ڕای وابوو کەچەند ئەندازەی زانست‌و ئاوەزت زۆر بیّ‌و، دارای زۆرترین زانیاریی‌و لەبەرکردن بیت، تێکڕایان بایی ئەو باوەڕە سادەو بەسیتە نییە. لە شا بەیتێکدا لەتەك خۆیدا دەکەوێتە قسەو دبێژیّ:" **ئەو هەژارەی کە لە کۆمەڵگە یاخییە، تەنها دوو وشەی چکۆلە نەبێت کە لە جەستەیا دێت‌و دەچیّ‌و تێکڕای بیرو هۆش‌و هزری داگرتووەو ئەویش هەردوو وشەی: (لا إله إلا الله، محمد رسول الله) یە، هیچی دیکەی لەبارگەو بنەدا نییە، زۆرن ئەو زاناو فەقیهانەی کە هەر یەکێکیان خاوەنی چەندان وشەی حیجازیی زل‌و زۆرن؛ بەڵام بەداخەوە چەشنی ئەو قاروونەن کە گەنجینەکەی هیچ سوودێکی پێنەگەیاند**[92]".

**ئیقبال** زۆر شانازیی بەم پەیکەی پێغەمبەری ئازیزو کەسایەتی ئەو سەیدە مەزنەوە دەکردو، لەهەمبەریدا غیرەیەکی زۆری لە خۆرئاوا نەکرد، هەرگیز ڕێگەی بەخۆی نەدەدا لەسەر سفرەی بێگانەو ئەجنەبی

---

[92]- روائع إقبال، ل ٢٥- ٢٧. (دانەر)

دابنیشێ، یان قوڕگی بەسەرچەشمەیەکی نامۆو غەریبە تەڕ بکات، بۆیە دەڵێت:

**" یارسول الله بەزەییت بە کەسێکی ڕشکن‌و زۆمدارو (غیور) هەژارێکی وەك مندا بێتەوە، کە هەرگیز کوپێك ئاوی لە ڕووباری بێگانە نەخواردۆتەوە".**

ئەو دەمەی لە سێی مانگی ئەپریلی سالی ۱۹۳٦ز لە شاری "**بەهۆپالی هیند**" کەوت و بیماری سەر جێگا بوو، دڵە گەورەو بەسۆزو ئەویندارەکەی لەدووری پێغەمبەری خۆشەویست هەژاو، گەلەك ئازاری بەدەست ئەو ڕەوشەی کە جیهانی ئیسلامی پێدا دەگوزەراو ئەو بۆشاییە فیکریی‌و ڕۆحیی‌و ڕەوانییەی کە تێی کەوتبوو هەروەها ئەو کەسایەتییە ئیسلامی کەنەقت و لاوازە ئابڕوبەرەوە دەکێشا. بەرادەیەك زۆرێك دادو فوغانی لەدەست تێکڕای ئەم نەوە نوێیە هەڵتروشکاوە بوو کە ڕوویی بەرەو بیرو هزری خۆرئاوا ناوەو، پشتیان لە پەیامو بەهاو مەرکەزییەتی پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) کردووە، هەستی شیعرو ئەستی ویژدان‌و دەنگی تەوژمی دڵو خرۆشانی ڕەوانی بەسەر پەڕەی نوێی سپیدا ڕژاو، دێڕ دێڕ وشەکان دەکەوتە سەر یەك‌و، بەیەك دەمو تێکراو دەماودەم لە جیهانی خەیاڵدا سکالای لەدەست سستیی‌و لاوازیی‌و لادانی ڕۆحیی ئەم ئوممەتە بێهیممەتە لەگن پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) دەکردو دەیفەرمو و[٩٣] :" **ئەی پێغەمبەری**

---

[٩٣] - روائع إقبال، ل ٢٥– ٢٧. (دانەر)

خۆشەویست(د.خ) سکاڵای خۆم لەدەست ئەم ئوممەتە دەکەم کە ترس لەمەرگ زاڵبووە بەسەریاندا، تۆ گشت بتەکانی چەشنی ((لات و عوززاو مەنات))ت تێکوپێکداو، ئەو جیهانە کۆنەت نوێ کردەوە کە پیری دایپزاندبوو و مەرگیش تێیدا کەوتبووە هەڵەکە سەما، ئیدی وایلێهات بەو پەڕی سۆزو باوەڕو ویردو بانگەوە تێکڕای جیهان بەخێرهاتنی ڕۆژێکی نوێیان کردو، لەڕێگەی ئەو شەهامەییەی کە فێرتکردبوون پشکی ئاگاهیی و ئامادەگیی و ڕووناکیی و خۆشییان وەرگرتبوو.

سەرباری ئەوەی ئێمە – زادەی وڵاتێکین گەلێك دێرینە لە بتپەرستیدا – بەڵام بۆ ساتێکیش نە "گا"مان پەرست نە "مانگا"و، نە سەرمان لەبەردەم کاهین و سەدەنەکانی پەرستگادا نەوی کردو نە لەبەردەم خوداوەندە کۆنەکاندا بەچۆکا کەوتین، هاوکات هەرگیز بەدەوری کۆشکی پادشایان و تەلاری ئەمیرەکاندا نەخولاوینەتەوەو تەوافمان نەکردووە، بێگومان تێکرای فەزڵی ئەمانە بۆ ئەو ئایینەو ئەو جیهادەی کە پێی هەستای دەگەڕێتەوە، ئێمە لەسەر ئەو سفرەیە پەروەردە بووین کە بۆ کۆی جیهانت ڕاخستبوو، ئیدی بەدرێژایی ئەم سەدانەی ڕابردوو قسەو گوفتارەکانت بۆ ئەم ئوممەتە، بوون بە سەرچاوەی شەوق و خۆشیی و کامەرانی، ئوممەتێك کە توانی سەربەز بێ و پێویستیشی بە هیچ کەس نەبێ، بەڵام بەداخەوە جیهانی ئیسلامی ئێستا زۆرێك لەمێژو بەهای خۆیی لەدەست داوە.

چواردەوری جیهانی ئیسلامی گەڕاەو، وڵاتانی عەرەب و عەجەم تەیی کرد، کەسم نەدی شوێنکەوتەی تۆبێ و بیروباوەڕی بەیادی تۆ نوێ

بکاتەوە؛ بەڵام ئەوانەی لە پێڕو گرۆهی ئەبولەهەب بوون گەلێ زۆر بوون، لاوانی ئیسلام ئاوەزیان ڕۆشنبوویەوەو، دڵو ویژدانیان تاریک بوو، ئەوان چەشنی حەریر بوون بەڵکو لەویش ناسکتر، کە نە هومێدێکیان پێیەو نە تێڕامانێکی دوور مەوداش، ئەوان لەسەر بەندایەتی پێگەیشتنو ئەوە دوای ئەوە لەسەر هەمان شێوەو ئەزم ڕێیان دەکرد، بەڕادەیەك وایان لێهات نە هێز و وزەیەکیان پێمابوو نە دەیانتوانی خەون بە ئازادیشەوە ببینن. بێگومان سیستەمی خوێندنو دامەزراوەکان وەها خواستی ئایینی لە کن تێکڕای ئەو لاوانە داماڵیی تا بوون بەئاردی بن دڕكو وەك دەوترێ بوون بە خەبەری کان، ئەوان بەچشنێ دڵیان بە خۆرئاوادا چوو بوو کە بەهای خۆیانیان لەیاد کردبوو، خواخوایان بوو خۆرئاوا پارچە نانێ یان لەتێ نانی جۆیان وەك خێر پێببەخشێ، خۆیان لە پێناویی تیکە نانێکی پووچو بێمایەدا فرۆشت، بەئەندازەیەك تێکڕای ئەو مەلۆیانەی کە بەئاسمانەوە دەیاندا لەشەقەی باڵ ئەمێستا چەشنی پاسارییەکی بێتوانایان لێهاتووەو بەهیچ کلۆجێ کاریان بەو ئاسمانە پانو بەرینەو بەو جەنگەڵستانە چڕە نەماوە.

**ئیقبالی** گەورە بەچەشنێك باسی ئومەتی ئیسلامیو لاوان دەکات وەك ئەوەی لە مۆخیان شارەزابێو کورتی و درێژی بەهای ئەو مرۆیانەی خاڵ بەخاڵ بزانێو چارەسەری ڕاستەقینەشیان بۆ وەدی بێنێ. لەبەرامبەریشدا بەهەموو کەینو بەینەکانی خۆرئاوا شارەزا بێو، بزانێت لەپشت هەموو کارێکیانەوە نیازێکی گڵاویان هەیەو دەیانەوێ

موسوڵمانانی پێفریو بدەن، بۆیە **ئیقبال** پێی وایە سەرجەم نەهامەتیی و چەرمەسەرییەکان کە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا دێت، هۆیەکەی دووریی و کەنارگرتنیانە لە ئایینە پڕ شکۆیەکەی پێغەمبەری نازدار؛ چونکە گەر تێکڕای جیهانی ئیسلام لەم حەقیقەتە بگەشتنایە کە چەندە بەدوای خۆرئاواوە دڵ پەروان‌و خۆشیان لەشوێنکەوتنی ئەوان دێ، ئەوا زۆر بەباشی بۆیان دەردەکەوت کە بەدرێژایی چەندین ساڵە چەندێك خەسارەتیان لەدەست ئەو شوێنکەوتن‌و بەگوێکردنەی خۆرئاوا کردووە، پێم خۆشە لێرەدا هۆنراوەی (( **مامۆستا جوتیاری**)) گەورە شاعیر[٩٤] کە لەپەسنی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا نوسیویەتی‌و تیاشیدا ئاماژە بە (**ئیقبال**)ی گەورەو چەندان شاعیر و کەڵە زانای دیکە ئەکات، بخەمە بەر دیدەی ئێوەی هێژا، کە دەڵێت:

**ڕۆحم فیدای ڕێبازەکەت، پێشەواکەم ئەی سەروەرم**

**شایستە نیم، بەگەردی ژێر پێڵاوت بم، تاجی سەرم**

**ئەی سەروەری کائینات‌و، تکا خوازی ڕۆژی مەحشەر**

**ببورە منی نا لایەق، بەچەند وشەی بێ سەرو بەر**

---

[٩٤] - وەك خۆم زۆر تامەزرۆی شیعری ئەم پیاوە گەورەیەم، هەرچەن دوور بەدوور نەبێ ئەم پیاوە مەزنە ناناسم بەڵام کۆی هونراوەکانی کاریگەرییەکی تەواوی لەسەر ژیانم وەك موعجەبی ئەو پیاوە هەیە. (*غوڵامی*)

گەشتێکی عیرفانی................................ غوڵامی

لە وەسفی تۆدا چی بڵێم؟ خوا دەفەرموێ: ڕەوشت بەرزی

نە" حەسسانم"، نە "بوسیری"نە"ئیقبال"م، نە "شاعومەر"

نە"مەحوی"م و نە "بێخود"م، نە"نالی"م و نە"مەولەوی"

نە"سەعدی"و نە "نوورسی"م ((جوتیارێك))م وێڵی هونەر

بە پێنووسی بێ پێزەوە، پەنجەی لاوازی لەرزۆكم

چی بنووسم لە پێناسەت ئەی موژدەدەرو ترسێنەر

چاكتر وایە هەڵتوتێم‌و، هەڵتروشكانم دەست كەوێ

لەو دەریایی بێ پەڕی سۆزت ئەی خاوەنی حەزی كەوسەر

هەر چەشنی مامۆستا ((جوتیار))، پێم خۆشە ئاماژە بە هۆنراوەیەكی مامۆستا "سەید رەزا"[٩٥] بكەم، كە بەو پەڕی هەست‌و ئەوینێكی لێوان لێو لە سۆزەوە شاكارێكی نكویی‌و جوانی بۆ ئەو پێغەمبەرە مەزنە ﷺ نوسیوەو دەڵێت:

---

[٩٥] - هۆنراوەی مودەڕیس‌و پێشنوێژی خانەقای سەردەشت ((سەید رەزا))یە، لە شارۆچكەی سەردەشت كوردستانی ڕۆژهەڵات. بە سوپاسەوە ئەم هۆنراوەیەم لە دەستی هێژا، دكتۆر "عیرفان رەشید"ەوە، بەدەست گەیشت. غوڵامی

یارسول ﷺ تو هیممەتە مەردانەکەت

بێ نەوا، هاتومەتە دەرگانەکەت

سەر بەسەرکەردت سوپەر بێ بۆ بەڵا

گیانی شیرین، گیانەکەم قوربانەکەت

وا دڵم دانا لەبەر پێی رەە گوزەر

تا قەدەم رەنجان نەبن، میوانەکەت

خۆم و ئەولادو کەسم، سەرپاك فیدا،

بۆ سەقاو و خادیمی دەرگانەکەت

عاشقانت وەك پەپولەی دەوری شەم،

گیان دەبەخشن بێنە نێو ئاستانەکەت

شاو گەدا کەوتوون بە ڕوودا بۆ ئەدەب

تاکو ماچ کەن، خاکی بەرهەیوانەکەت

بەو هەموو لەهجەو زوبانە عەرزی حاڵ

بۆ نەجاتی ڕێزە خۆری خوانەکەت

ئەشکی حوزن و ئەشکی شادی تێکەڵن

حەشرە ئەوری بارەگا شاهانەکەت

دڵ بە وەسڵت مەست و سەرخۆشە بەڵام

کولبەتول ئەحزانە، لەبەر هیجرانەکەت

یا نەبیﷺ بەندە ئەوازیت بۆ ((ڕەزا))

خۆ شیفایە، دەستەکەم دامانەکەت..

لەڕاستیدا مامۆستایانی ئەم جیلە کاڵای زانستیان بە چەشنێ تێکەڵ و پێکەڵ بووە کە هیچ هەواڵێکیان لە پێکەو ڕێکەیان نەماوە، ئاگری خۆرئاوا ئەم ئەوەیەی وەك مۆمێك تواندەوەو، ڕەنگێکی دیکەی بەبەردا کردەوە، تا وای لێهات لەم جەهەندەمەدا ملشۆڕکاو بەتەواوی واتا بسڕدرێتەوە، ئەمێستا موسوڵمانان وایان لێهاتووە نازانن نهێنی و چێژی مردن چییەو، وەك باوەڕدارانی ئەوسا کە باوەریان وابوو ( لاغالب إلا الله) ئەو ئیمانەیان لەهەگبەدا نەماوەو دڵیان لەناو جەستەیاندا مردووەو وایان لێهاتووە بیریان لە خەو و خواردن نەبێ لای

هیچی دیکە نەماوە، ئەو لاوە موسوڵمانە بۆ خۆی خۆرئاوا دەکات بە داوەر بۆ ئەوەی کولێرەیەکی چنگ کەوێ، تەنانەت لەبەر سکی، منەتی سەدان کەس قەبوڵ دەکات، ئەمێستا تێکڕای شتەکان لنگاوقووچ بوونەتەوە، بەڕاڵەیەك بتشکێنو ئەوەی ئیبراهیم بووەتە (ئازەر)و بتان نەحتەکاو دەیکوڵێ، ئەو ئەمێستا لە ئیفرەنجو ئەورووپا بتە نوێیەکان دەکڕێ.

ئەم ئەوەی ئێستا لە هەموو کاتێ زیاتر پێویستی بە دووبارە زیندووبوونەوە هەیە، بۆ ئەوەی جارێکی تر پێی بڵێ: بە ئیزنی خودا هەڵسەرەوە(قم بإذن الله). ژیارو شارستانییەتی خۆرئاوا جادوویی لێکردین، ئەوان توانیان بێ ئەوەی لێما بدەنو جەنگمان لەتەکدا بکەن، بمانکوژن[٩٦]. ئەی پێغەمبەرە نازدار ئەوە خۆ هەر ئوممەتەکەی تۆ و هاوەڵانت بوون توانیان عەرشی کیسراو قەیسەری ڕۆم بگرنە دەست،

---

[٩٦] - بەڵێ ڕۆژئاوا بەم چەشنە لەتەك ئێمەدا دەجوڵێنەوەو لەگەڵ کەسانو هاونیشتمانیانی خۆیاندا زۆر بە ئەمەکداریو بەو پەڕی دڵسۆزییەوە کار دەکەنو مامەڵەیان لەتەکدا دەکەن. وەك دکتۆر (ئەحمەد زومیل) دەڵێ: " ئەورووپاییەکان لەئێمەمانان زیرەکترو زرنگتر نین؛ چونکە ئەوان پاڵپشتی لە دۆڕاو دەکەنو هەڵوێستیان بەرامبەری هەیە، بۆ ئەوەی دواجار سەرکەوتووبێت؛ بەڵام ئێمە لەتەك مرۆڤانی سەرکەوتودا دەکەوینە هێرش کردنە سەریو دژایەتی کردنی بۆ ئەوەی بدۆڕێ‌و، گەر بۆ جارێکیش بووە هەست بە سەرکەوتووی خۆی نەکات". (*غوڵامی*)

ئەمێستاش جیهان چاوەنواڕی شۆڕشگێڕێکی نوێیە کە باوەڕی بەخودا هەبێ‌و لەهەمبەر غەیری خوادا بێباوەڕ بێ‌و، تەلیسمی ئەم شارستانییە بشکێنێ‌و جادووەکەی بەتاڵ بکاتەوە.

ئەی سوارچاکی بەئەمەك ڕۆح‌و ڕەوانم قوربانت بێ، دەسا تویی خودا جڵەوی ئەسپەکەتبەدەستەوە بگرە و، ساتێك گوێ بۆ خەم‌و خەفەت‌و ئازارە جاویدانییەکەم ڕادێرە، چیبکەم ئەمێستا زوانم تەتڵە دەکاو دەربڕینیشم خیانەتم لێدەکات، من هەردەم لەنێوان سوڵتانی سۆزو سوڵتانی ئەدەبدا ململانێمە. سۆز پێم دەڵێ: ئازابەو چاپووکانە وەخۆت کەوەو قسەی خۆت بکە خۆ تۆ گەلێك لە خۆشەویستەکەتەوە نزیکی. ئەدەبیش دێتە پێشەوەو دەبێژێ: ئاگاداربەو فزوولی مەنوێنەو خۆتی تێهەڵنەقورتێنی، چاوانت بکەرەوەو لێوەکانت دابخە، بەڵام سۆزو هەستم زۆر سەرکەش‌و هەژێنەرەو، مل بۆ ئەدەب کەچ ناکاو دەڵێ من تەنها لاکردنەوەیەکم لەتۆ دەوێ، من ئەو ئاسکە سەرکە ونبووەم کە زۆر کەس بەدووەمدا وێڵن‌و، ڕاوچییەکانیش وازیان لێی هێناوە، بۆیە بۆ کارێکی گەلێ گرنگ پەنام بەحەرەمت هێناوەو خۆم خستە کۆشی مەدینەکەتەوە؛ چونکە دەنگم لەگەرووەمدا خنکاوەو نایەتە دەرەوەو، بڵێسەی وتنیشم لەسنگمدا تێناپەڕێ‌و، هەناسەشم لەنێوەندی دەنگی خنکاو بڵێسەی سنگمدا، ((مەحوی)) گووتەنی: پساو، ماو، بێ ئەسەرچووە، من دەمێکە چەشکەم لە خوێندنی قورئانی بەرەبەیان

نەبردووەو، هەر بەیەکجاری پشتم تێکردووە. لەڕاستیدا کاری من زۆ لەکاری ((فەرهاد)) گرانترو قورسترە کە دەیویست هەر بەزۆر ڕووباری شیر لەو کێوە ڕەق و تەقە هەڵقوڵێ[97]، بۆ ئەوەی ڕکابەریی سەرسەختی ئەم کێوەش بکەم پێویستیم بەچەندین ئالەتی تیژترو بەهێزتر هەیە، تا کارەکەم بەکۆتا بگەیەنەو، ئارەزووەکەم جێوەجێ بێ، ئیدی دواجار منیش باوەڕدارەو هەرگیزیش گاڵتەم بە کەسایەتی و بەهرەمەندی خۆم نەکردووەو تا سەر ئێسقان بڕوام بە خۆم هەبووە، هەروەك چۆن دەبێت هەموو کەسێکی بڕوادار هەمان ئەم پەیڕەوەی هەبێت، دەسا بمدە لە هەسان (المِسن، المشحذ) چونکە من لەو ئاسنەم کە ئەوەی کانگایەکی سەخاوەتمەندە.

من سەرباری ئەوەی گەنجێتیم لەدەست چوو و ژیانیشم بەفیڕۆدا، بەلام خۆ خاوەنی شتێکم کە پێی دەوترێت (دڵ) ئەو دڵەی کە هەردەم هێرشی دەکەمە سەرو لەبەر چاوی خەڵکیش دەیشارمەوە، چونکە هەڵگری شوێنەواری جێپێی ئەسپە ڕەسەنەکەتە، بێگومان ئەو بەندەیەی پشتی لە نازو نیعمەت و جوانییەکانی دونیا کرد تەنها بە بەسۆزو بەزەیی و ڕەزامەندی گەورەو پێشەواکەی دڵی تیمار دەبێ و هەر

---

[97] - مەبەستی ئەوەیە زۆر هەوڵیدا کە فەلسەفەی خۆرئاوا مڵکەچی خۆی بکات، تا ئەوەی بتوانێ لێیەوە فەلسەفەو بیرێکی نوێ بێنێتە کایەوە، کە خزمەتی ئیسلامی پێبکات. (دانەر).

گوفتارەکانی ئەویش دەتوانێ تیماری قەلبی داغداری بکات، ئەو دڵەی کە ژیانی کۆچ و دووری لە دڵدارو خۆشەویستەکەی بە مەرگێکی حەقیقی دەزانێ.

دەسا نەی ئەو کەسەی شەیدایی‌و خۆشەویستی عەرەبت خستۆتە دڵی کوردییەکەوە[98]، بە ڕێکەبدە بە هیندییەکش لەبەردەمتدا ڕاوەستێ‌و باسی کوژان‌و خەم‌و خەفەتە جاریدانییەکانی خۆیت لە کن بدرکێنێ، ئەو هیندییەی هەڵگری دڵێکی خەفەتبارو، جگەرێکی زامدارە (مقروح)، کە ئێستاشی لەتەك بێ هاوەڵ‌و ڕەفیقەکانی نازانن کە ئەو تووشیاری چ خەم‌و ئازارو خەستەیەك بووەتەوە، ئەو هەردەم چەشنی ئەو نەیەیە[99] کە بۆ ساتێکیش ئارامی نییەو دەنگ‌و ناڵەو نزووڵەی لێ بەرزدەبێتەوە، ئاوازە خەمبارو لێو بەبارەکانی لێنابڕێ، من وەك چیلکەی ئەو بیابانەم کە کاروانییەك بەلایدا تێدەپەڕێ‌و ئاگری تێوەردەدات‌و، دواتر چاپوکانە دەکەوێتە غارو تێیدەپەڕێنێ‌و بەجێی

---

[98] - مەبەستی پێشەوای کورد " سەڵاحەددینی ئەییوبی"یە. (دانەر)

[99] - وەك (مەولانای ڕۆمی) دەفەرموویت:

بشنو از نی چ حیکایت می کند

از حال جودائی شکایت می کند

واتە: گوێ بۆ نەی ڕادێرە چ چیرۆکێ باس دەکا، چۆن لە دەست دەردی جودایی سکاڵای حاڵی خۆی دەکا". (*غولامی*)

**دێڵێ، ئیدی ئەو چیلکە بە ئاگر تێبەربوویی وەك خۆی دەمێنێتەوەو، چاوەڕوانی کاروانێکی دیکەیە؛ تا بێت و بڵێسەی ئاگری بەتینی دامرکێنێتەوە، ئەدی دەبێ لەم بیابانە کاکی بەکاکییە تاریکەدا، کەنگێ ئەو کاروانییە نوێیە بەلایدا گوزەر بکات"؟!.**

**لە کۆتاییدا بەچەشنی (( مەسعوود موحەممەد ))ی شاعیرو ئەدەب دۆستی گەلی کورد، پێتان دەڵێم:**

**دەستێـك گـوڵ، دەستـێك نـێـرگـز**

**مەرگی کوردو کوردستان نەبینم هەرگیز**

***

Zana naje ghulamy

٢٠١٤/٥/٧

## سوپاسنامە

زۆر سوپاسی هاوڕێیانی بەڕێزم ((کاکە نەبیل و، هیوا مەحموود)) دەکەم، کە خاکییانەو گەر بە ووشەیەکیش بێ، لە ئامادەکردنی ئەم پەرتووکەدا یارمەتیان داووم.

((غوڵامی))

## بەرهەمەکانی وەرگێڕ

| ژ | ناوی پەرتووک | نووسەر | وەرگێڕ | ساغکردنەوەو پێداچوونەوە نووسینەوەی |
|---|---|---|---|---|
| ١- | پەیامی ڕۆح | د. خەدیجە نەبراویی | غوڵامی | - |
| ٢- | دەستی قەدەر | باباعەلی سوڵەیی | غوڵامی | - |
| ٣- | زنجەکەی مام تۆم | هاریت ستاو | باباعەلی سوڵەیی | غوڵامی |
| ٤- | دیدێکی ئیسلامی نوێ بۆ چەمکی جیهادو خیلافەت و وەلاء و بەراء | پ.د. عەلی قەرەداغی | غوڵامی | - |
| ٥- | لەپێناوی تاجا | موستەفا لوتفی ئەلمەنفەلوتی | باباعەلی سوڵەیی | غوڵامی |
| ٦- | مفهوم القيم الاسلامية وحاجة المجتمع المعاصر إليها | الغولامي | | - |
| ٧- | گەشتێکی عیرفانی بەرەو مەدینەی مونەووەرە | ئەبولحەسەن ئەنەدویی | غوڵامی | - |

geştêkî îrfanî berew

# medîney minewere

ئەو لەمێژە لێرە نییە و دەنگ و سەدای هەر نوێ یەو بەردەوام بەبێ تەقولباب خۆی بەناو ژوور بەژووری دڵ و ویژدانماندا ئەکات، ئەو بە خۆی و قافڵەیەك خۆشەویستییەوە هەمیشە میوانی مرۆڤە، ئەو بە خۆیی و زەمیلەیەك نەورەسەوە، قاچ لە ئاسمانی باوەڕمان گیر دەکات. بەوەدا دەیناسمەوە جانتایەکە بۆ هەموو سەفەرێك و سەفەرێکە بۆ گەشتی دنیاکان. چیت پێبڵێم ئەی دۆستی من؟ جێگەی نوستنەکەت کە خودا لەپەڕاوەکەیدا تۆماری کردووە، دڵی هەژارانەو پێخەف ژیانی ماڵ بە ماڵی ئەم دنیایەیە. ئەمێستاش دەیبینم، بەڵێ ئەوە ئەوە کە" بە ئەوینە تەژییەکەیەوەو، بەسۆزی پڕ تاسەیەوەو، بەهەمان ئەو وەجدەی جارانیەوە، دەستە گوڵی ئاشتی بەسەر تێکرای شەرەنگێزانی جیهاندا دەبەخشێتەوەو، دەستی میهر بەسەر سەری بێنەوایان و لانەوازان و دڵپەستیواندا دەهێنێ و، ئاوی سازگاری سەرچەشمەی چەشنی دیدەی قرژاڵ کە خۆری زیوینی بەرەبەیان داباریبێتە سەری، بەقورگی ووشکی کرێکارانی دڵماندو و دەست وپێ قڵیشاوی دنیا دەکات و، پێیان دەڵێت:" ئیدی ساتێك لەدەستی چەرخی چنگ بەخوێنی کەونەوە ئۆقرە بگرن و تاوێك بحەوێنەوە".

ڕێبوارێکی ماندو وای ووت






ZANA NACÎ XULAMÎ
2014

ژمارەی سپاردنی (١٨٥١) پیدراوە.